گۆڤارێکی هزریی ڕۆشنبیریی وەرزییە، ژمارە (٣٩) زستانی ٢٠٢٣

بە سپۆنسەری سەنتەری زەهاوی بۆ لێکۆڵینەوەی فیکریی

خاوەنی ئیمتیاز و سەرنووسەر
تۆفیق کەریم

٠٧٥١١٤١٢٥٤٣ - ٠٧٧٢٢٦٢٧٦٦٤
tofeqkarem@yahoo.com



سایتی گۆڤاری خاڵ
www.xallkurd.com

تیراژ: ١٥٠٠
نرخ: ١٥٠٠ دینار

# ناوەڕۆک

**تەوەری ژمارە:**



**بابەتی گشتی:**







تەوەری داهاتوو

# پرسی گەنج لە کۆمەڵگەدا

## ئاڵنگارییەکانی ئێستا و هەلی داهاتوو

دوای ئەو گۆڕانکارییانەی لە جیهاندا ڕوویاندا و ڕوودەدەن لە هاتنی کۆرۆنا و لاوازی گەشەی ئابووری وڵاتان و لێکەوتەکانی شەڕی ڕووسیا و ئۆکرانیا، ناوەندەکانی توێژینەوە جەخت لەوە دەکەونەوە کە جیهان بەرەو دووبارە بنیاتنەوە و گەشە هەنگاو دەنێت، پشکی شێریش لەم هەستانەوەیە بەر ئەو وڵاتانە دەکەوێت کە ڕێژەی دانیشتووانیان لەناویشیاندا گەنجان زۆرە، هەربۆیە دەیەی داهاتوو پێشبینی دەکرێ سەردەمی گەنجان و بەکارخستنی وزە و زیرەکییان بێت، بۆیە ئێمە دەپرسین:

١. ڕۆڵی گەنجان لە بەشداری کایە جیاوازەکانی کۆمەڵگەدا چۆن هەڵدەسەنگێنن؟ ئایا سەدەی ڕابردوو سەدەی گەنجان بوو یان بە پێچەوانەوە؟

٢. کاریگەریی و لێکەوتە جیاوازەکانی ژیانی هاوچەرخ چۆن دەبینن لەسەر گەنجان؟ تا چەند پێشکەوتنی زانست و تەکنۆلۆجیا لە خزمەتی ئەو توێژەدا بووە؟

٣. خەمی گەنجان لەنێو کۆمەڵگە ڕۆژهەڵاتی و ڕۆژئاواییەکاندا جیاوازی چییە؟ بۆچی گەنجانمان ڕوو لە وڵاتانی ڕۆژئاوا دەکەن؟

٤. هەلی کار و گەیشتن بە خەون و خولیاکان و بەدەستهێنانی بڕوانامەی باڵا تا چەند پاساوی واقیعین بۆ کۆچی گەنجان و بەجێهێشتنی وڵات؟

٥. لە کۆمەڵگە ڕۆژهەڵاتییەکاندا و لەناویشیاندا کوردستان چەندێک بەرژەوەندی و پێگەی گەنج لە بڕیار و دابینکردنی مافدا لەبەرچاو دەگیرێت؟

٦. ڕۆڵی گەنجان چۆنە لە دامەزراوە مەدەنی و ناحکومییەکاندا؟

٧. ئایا گەنجان خۆیان توانیویانە ڕووبەڕووی ئاڵنگارییەکان ببنەوە و تواناکانی خۆیان بسەلمێنن؟

٨. پرۆژەی بچووک یان کارگەی گەورە، کامیان هەلی کاری زیاتر بۆ گەنجان دەرەخسێنن؟

٩. دەسەڵاتی سیاسی یان کۆمەڵگە بەرپرسی یەکەمە لە ماف و داهاتووی گەنج؟

١٠. گەنج و ئینتیما دوانەیەکی گرنگ و بەیەکەوە بەستراون، ئەمە ڕەهەندی ئیجابی و سەلبی هەیە لە ژیاندا، چۆن ئاڕاستە بکرێت؟

. داواکارین لە نوسەرانی بەڕێز، لێکۆڵینەوەکانیان لەسەر ئەو تەوەر و بوارانەی کە ئاماژەیان پێدراوە تا ڕێکەوتی (٢٠٢٣/٣/١٠) بنێرن بۆ گۆڤارەکەمان.

تەوەری ژمارە

# ئاریشەکانی خوێندنی ئایینی لە کوردستان

لە کوردستاندا بۆماوەی چەندین سەدە خوێندن تەنها لە ڕێگەی قوتابخانە ئاینییەکانەوە بووە، مەلا و حوجرەکان ببوون بە سەرچاوەیەکی فرە ڕەهەند و لەڕێگەی ئەوانەوە زانست و هزر و ڕۆشنبیری لەنێو کۆمەڵگەدا بڵاودەبوویەوە، بەڵام ساڵانێکە ئەم ناوەندە زانستییە لە پاشەکشەدایە و، چیتر کاریگەریی جارانی نەماوە.

ئایا هۆکاری ئەم پاشەکشە، خودییە یان بابەتی؟ خاڵە بەهێز و لاوازەکانیان چی بوون؟ ئەو کاریگەرییانە چی بوون حوجرە و مەلای کورد بەسەر کۆمەڵگەوە بەجێیان هێشت؟ ئایا لەگەڵ پاشەکشە و کاڵبوونەوەی حوجرەدا ڕۆڵی ئاینیش کاڵ دەبێتەوە؟ ئایا دەکرێت ناوەندە زانستییە ئاینییەکان و ئەکادیمییەکانی بواری شەریعەت جێگەی حوجرە و مەلای جاران بگرنەوە؟ پرۆژەی شارەزایان بۆ پڕکردنەوەی ئەو کەلێنە چییە؟

لەم ژمارەدا ئەم پرسیارانە و گەلێک پرسیاری ترمان سەبارەت بە هەمان بابەت لای شارەزایانی ئەم بوارە وروژاندووە، بەسوپاسەوە هەریەکەیان بیروڕای خۆیان بەشێوەیەکی زانستی و پشتئەستوور بە بەڵگە و لۆژیک دەربڕیوە و تەوەری ئەم ژمارەیان بۆ دەوڵەمەند کردووین، ئومێدەوارین نوسینەکانیان تینوێتی خوێنەری بەڕێز بشکێنن.

گۆڤاری خاڵ



د.حسەین محەمەد ئیبراهیم

# خوێندنی ئایینی لە بەردەم پێداچوونەوە و نوێگەریدا

چاکسازیی لە هەموو بوارەکانی ژیاندا پرۆسەیەکی گرنگ و درێژخایەن و بەردەوامە، کۆمەڵگە زیندوو و ئارامەکان هەمیشە لە بیر و ئەندێشەی بەرەوپێشبردنی تەواوی بوارەکانی ژیان و هزر و ڕۆشنبیری گەلەکانیانن، خوێندنیش وەك هەوێنی هەموو گۆڕانکارییەك نابێت بەدەربێت لە بیری چاکسازیی و دەبێ هەمیشە کار بکرێت لەسەر نوێکردنەوەی ئامراز و شێواز و میتۆد و ئامانجەکانی.

ئایین وەک بزوێنەری تەواوی کۆمەڵگە لەڕووی هزر و ئەندێشەوە، وەک بنەمای تێگەیشتن لە خود و ئامانجەکانی مرۆڤ لەسەر زەوی؛ پێویستییەکی زۆری بە فێربوونێکی تەندروست هەیە، پێوستییەکی زۆری بە ڕەچاوکردنی میتۆدێکی سودبەخش هەیە بۆ پێشکەوتن و پەروەردەکردنی کۆمەڵگە بەشێوەیەکی باش و گونجاو لەگەڵ واقع و ڕەوشی مرۆڤ بەرەچاوکرنی چەرخ و کەتوارەکەی کە تێیدا دەژێت. لەڕاستیدا خوێندن و فێرکردنی ئایین پێویستی بە میتۆدێکی جوڵاو هەیە، کە هەمیشە لە نوێبوونەوە و دۆزینەوەی ڕێکار و ئامرازی نوێدا بێت، بۆ ئاوێتەکردنی لەگەڵ زانستەکانی تر و بەکارهێنانی وەک سەرچاوەیەکی ڕەسەن و پێویست بۆ تەواوی ئەو زانستانە.

**ئەگەر لە فێربوون و فێرکردنی زانستە مرۆیی و پراکتییەکانیش ڕەوچاوی بنەما سەرەکی و بەها بەرزە ئاینییەکان نەکرێت ئەوا زانستی بێ ڕەوشت و نامرۆییانە دەردەچن**

زانستە شەرعییەکان ئەگەر بەشێوەیەکی تەندروست نەخوێندرێن و کەنارگیری دروست بکات لە نێوان زانستە کەونی و ئینسانییەکانی تر؛ ئەوە دەبێتە هۆی دواکەتن و خۆخواردنەوەی کۆمەڵگەکان و توندئاژوویی و سوڕانەوەی لە بازنەیەکی داخراودا ، دەبنە زانستگەلێکی تیۆریی و دەرناچن بۆ پراکتیکەکردن و جێبەجێکردن لە واقعدا. هەروەها ئەگەر لە فێربوون و فێرکردنی زانستە مرۆیی و پراکتییەکانیش ڕەوچاوی بنەما سەرەکی و بەها بەرزە ئاینییەکان نەکرێت ئەوا زانستی بێ ڕەوشت و نامرۆییانە دەردەچن، کە ڕەنگە لە هەرقۆناغێکی مرۆڤایەتیدا ببنە هۆکاری دارمانی ژیان لەسەر زەوی و چەندین بەڵاو کاولکاری بەسەر مرۆڤایەتیدا بهێنن.

کەواتە دەتوانین بڵێن میتۆدی فێرکردن و فێربوون ڕۆڵێکی یەکجار گرنگ دەبینن لە بەرەپێشچونی ڕەوشی خوێندن بەشێوەیەکی گشتی و خوێندنی ئایینی و شەرعیش بەتایبەتی، کە ئەویش دەبێتە هەوێنی بنیاتنانی زانست و زانای بەرهەمدار بۆ مرۆڤ و کۆمەڵگەکان، هەر کەم و کوڕییەکیش لەو بوارەدا بەقەدەر خۆی زیان بە خودی خۆی و

کۆمەڵگە و مرۆڤایەتی دەگەیەنێت. ئەگەر کەمێک بگەڕێینەوە بۆ مێژوو دەبینین خوێندنی ئایینی و شەرعی بە چەندین میتۆدی جۆراوجۆردا تێپەڕیوە، لە هەندێ قۆناغدا کاریگەری زۆر ئەرێنی لەسەر ڕەوشی مرۆڤایەتی بەجێهێشتووە و بۆتە هۆی بەرپابوونی ئاشتی کۆمەڵایەتی و بەرەوپێشچونی زانست و مەعریفە جۆراوجۆرەکان، لە هەندێک قۆناغیشدا زیانی گەورە بە ڕەوشی زانست و ژیار گەیاندووە، ڕۆڵی زانستەکان حەساری قوتابخانە ئاینییەکانیان جێنەهێشتووە، زانستە مرۆیی و پراکتیکی و پزیشکییەکان لەوپەڕی دواکەوتووییدا بوون، ئەمەش بەهۆی زاڵبوونی تەقلید و چاولێکەری و داخستنی دەرگای ڕادۆزیی و وابەستەبوون بە کتێب و پەڕاوی زانایانی پێش خۆ و کورتهەڵهێنانی خوێندن و نوسینەکان لەسەر ڕاڤە و سەرنج و پەراوێز لەسەر دانانیان..

لە دنیای ئەمڕۆی ئێمەشدا خوێندنی ئایینی لە ئاریشەدایە، زانست و مەعریفە ئاینییەکان بێ ڕۆڵ کراون، دامەزراوەکانی ئەم جۆرە خوێندنە بە چەندین کێشەی جۆری و تەکنیکی و بەڕێوەبردنەوە دەناڵێنن، شێوازی خوێندنی ئەم زانستانە پێویستییەکی زۆری هەیە بەڕیفۆرم و چاکسازی. ئەگەر بەشێوەیەکی گشتی بڕوانینە خوێندنی ئایینی وشەرعی لە جیهانی ئەمڕۆدا دەبینین لە دوو شێوازی سەرەکیدا خۆی دەبینێتەوە:

**شێوازی یەکەم:** شێوازی کۆن کە لە قوتابخانەی مزگەوت و حوجرەکاندا پەیڕەو دەکرێت و چەقی فێرکردن لەلایەن یەک مامۆستا یان چەند مامۆستایەکی کەم لەسەروویانەوە مامۆستای یەکەم پیادە دەکرێت، خوێندکارێک یان چەند خوێندکارێکی کەم بە میتۆدێکی دیاریکراو کتێبێک دەخوێنن تا تەواو دەبێت پاشان دەست دەکەن بە خوێندنی کتێبێکی تر.

پرۆگرامی دیاریکراو بۆ ئەم شێوازە هەر لە کۆنەوە دیاریکراوە -بەتایبەت لەم ناوچانەی ئێمەدا- کە لە سەرەتادا فێرخواز فێری خوێندنەوەی قورئان دەکرێت و پاشان هەندێ کتێبی سەرەتایی دەخوێنێت لە زمانی عەرەبیدا، وردە وردە هەڵدەکشێت لە فێربووندا پتر لە شەش کتێب لە زانستەکانی نەحو وصەرف دەخوێنێت – کە ئەمەش بەپێی قوتابخانەکان دەگۆڕێت- هەروەها زانستی بەلاغە و مەنتیق و عەروز و زانستی کەلام دەخوێنێت، پاشان فیقهی مەزهەبێکی پەیڕەوکراو دەخوێنێت بەپێی ئەو شوێنەی کە ئەو مەزهەبە تیایدا بەرجەستەیە، پاشان وانە کۆتاییەکان دەخوێنێت لە ئصولی فیقە و زانستی کەلام و فەلسەفە، لە کۆنیشدا و ئێستاش لە هەندێک شوێن عیلمی فەلەک و هەندەسە و ماتماتیک بەشێوازە تەقلیدییە کۆنەکەی دەخوێنرێت. هەرچەندە ئەم پرۆگرامە زیاد و کەمی تێدا کراوە لە هەندێک لە شوێنەکاندا، بەڵام بەشێوەیەکی گشتی لە بازنەی ئەم زانستانە دەرناچێت.

له کۆندا و تا دەیەکانی ڕابردووش و ئێستاش له هەندێک شوێن خوێندکارەکان لەژوورێکی مزگەوتدا دەمێنێنەوە کە پێی دەوترێت (حوجرە)و ڕۆژانە لەکاتێکی دیاریکراودا وانەکانیان دەخوێنن، ئەم مانەوەیەش ڕێکخراوە بە چەندین ڕێکار و یاسا و ڕێسا کە لێرەدا ناتوانین تیشکی بخەینەسەر.

**شێوازی دووەم:** شێوازی ئەکادیمی کە خۆی دەبینێتەوە لە خوێندنی زانستە ئاینییەکان لە زانکۆ و پەیمانگا و قوتابخانە ئاینییە دەوڵەتییەکاندا.

ئەم شێوازەش لە خوێندنی زانستە ئایینی و شەرعییەکان تیایدا دەوڵەت ڕاستەوخۆ پەیڕەوی سالآنەی ئامادەکراوی فەراهەم کردووە و لەلایەن هەندێک لە پسپۆڕانەوە گونجێنراوە لەگەڵ دامەزراوە فێرکارییەکانی تری پەروەردە و زانکۆ و پەیمانگاکان، لە زۆربەی ڕێنمایی و پلان و شێوازی خوێندن و مامۆستا و ماف و ئەرکەکاندا وەک ئەو دامەزراوانەی لێکراوە.

قوتابخانە ئاینییەکان کە لە شەشی سەرەتاییەوە خوێندکار وەردەگیرێت، لەم شەش ساڵەدا خوێندکار بە پرۆگرامێکی گونجێنراو وانە شەرعییەکان و بەشێک لە زانستە مرۆیی و زانستییەکانی تر دەخوێنێت، هەروەها زانکۆکان کۆلیجێکیان تایبەت کردووە بە خوێندنی زانستە شەرعیی و ئیسلامییەکان و لەماوەی چوارساڵی زانکۆیی خوێندکار بە ئاستێکی بەرزتر لە خوێندنگا ئاینییەکان زانستە شەرعییەکان فێر دەکرێت و لە پرۆگرامەکاندا جگەلە خوێندنی زانستە شەرعییەکان بەشێوەیەکی قوڵ زیاتر جەخت دەکرێتەوە لە بابەتەکانی مەبەستەکانی شەریعەت و فیقە و ڕۆشنبیری ئیسلامی و بیروباوەڕ، خوێندکارەکانیشی زیاتر لەو خوێندکارانەن لە ئامادەییە گشتییەکانەوە هاتوون بۆ ئەم کۆلێجانە کە زۆر کەم پاشخانی زانستە ئیسلامییەکانیان هەیە و پێشتر ئاشنایەتییان نەبووە بەم زانستانە، هەروەها لە زمانی عەرەبیدا لاوازن و کەمتر دەتوانن لە زاراوکانی ئەم زانستانە تێبگەن. لەهەمانکاتدا هەندێ خوێندکاری قوتابخانە ئاینییەکانیش هەن کە لەم کۆلێجانە وەردەگیرێن و ئاستیان بەرزترە لە قوتابیانی قوتابخانە گشتییەکان لە زانستە شەرعییەکاندا و ئاشنان بە زاراوە شەرعییەکان، بەشێک لەو زانستانەی کە دەخوێنرێن لە کۆلێجەکاندا ئەوان سەرەتایەکیان لێ خوێندووە. زۆرکات ئەم دوو جۆرە خوێندکارە لە پۆلەکاندا تێکەڵ دەکرێن و وانەیان پێدەوترێتەوە و یەک پرۆگرام بەسەریاندا جێبەجێ دەکرێت.

لەڕاستیدا لە دنیای هاوچەرخدا هیچکام لەم دوو شێوازە خاڵی نییە لە سەرنج و تێبینی، هەریەکەیان چەندین لایەنی ئەرێنی و نەرێنی لەخۆدەگرن بۆ بەڕێوەچونی ڕەوشی خوێندن و فێربوون و قوڵبوونەوە لە زانستەکاندا، و دانانی کاریگەری لەسەر کۆمەڵگە.

لایەنە ئەرێنییەکانی خوێندنی ئایینی بەشێوازی کۆن:

ئەگەر لایەنە ئەرێنییەکانی شێوازی خوێندنی ئایینی بە شێوازی کۆن باس بکەین لەڕاستیدا زۆر لایەنی ئەرێنی تێدا دەبینرێت، لێرەدا ئاماژە بە هەندێکیان دەکەم:

**یەکەم:** خوێندنی کۆنی حوجرەکان کەسانی نوخبەی ڕۆچوو لە زانستە زمانەوانی و عەقڵییەکاندا بەرهەم دەهێنن، ئەوانەی دەرچووی ئەو قوتابخانانەن زۆرکات لە زانستەکانی نەحو سەرف و بەلاغە و لۆجیکدا کەسانی بلیمەت و بەتوانان، کە توانای ڕاڤەی دەقە قورسەکانیان هەیە.

**دووەم:** ئەم قوتابخانانە کەسانی میانڕەو و بەڕێز لەگەڵ زانست و زانایان پەروەردە دەکەن، ئەوەی دەرچووی ئەم قوتابخانانە بێت هەرگیز بە چاوی کەم سەیری هیچ یەک لە زانایانی پێشوو و هزر و بیروبۆچونەکانیان ناکات، ئەمە بەشێکە لە پەروەردەی ئەم قوتابخانانە و هەر لە سەرەتاوە بەم شێوەیە پەروەردە دەکرێن.

**سێیەم:** لەم شێوازە خوێندنەدا خوێندکار ئازادە لە هەڵبژاردنی مامۆستاکەیدا، دەتوانێت هەرکات یەکێک لە مامۆستاکانی بەدڵ نەبوو مامۆستاکە و قوتابخانە و حوجرەکەی بگۆڕێت، کە ئەمە فرسەتی فراوانبوونی ئاستی مەعریفی زیاتر دەکات و لایەنی جۆری لە فێربوون زیاد دەکات، ئەم ڕێکارە ئێستا لە زانکۆ جیهانییەکاندا پەیڕەو دەکرێت و دەرهاویشتەی زۆر ئەرێنی هەبووە.

**چوارەم:** لەم جۆرە خوێندنەدا کات بۆ فێرکردن و فێربوون والاترە، زۆر کات مامۆستا زۆر بە ئازادانە بێ گوێدانە کاتی دیاریکراو وانەکان بەخوێندکار دەڵێتەوە، چونکە کەمی خوێندکار و وانەکان وادەکات هەم خوێندکار و هەم مامۆستا بتوانن کاتێکی زیاتر بدەن بە وانەکان.

پێنجەم: یەکێکی تر لەلایەنە ئەرێنییەکانی ئەم جۆرە خوێندنە ئەوەیە کە خوێندکار کاتێک هەندێک لە کتێبەکان دەخوێنێت دەبێت وانە بڵێتەوە بە خوێندکارەکانی خوار خۆی، واتە لە خوێندنگەی ی حوجرەکاندا خوێندکارەکان دوو قۆناغن، قۆناغی یەکەم پێیان دەوترێت (سوختە) ئەمانە ئە و خوێندکارانەن کە وانە و کتێبە سەرەتاییەکان دەخوێنن، قۆناغی دووەم کە خوێندکارەکانی پێیان دەوترێت (موستەعید) ئەوانەش ئەو خوێندکارانەن کە کتێبە ناوەندیی و کۆتاییەکانی پرۆگرامی فەقێیەتی دەخوێنن. جا مامۆستای گەورە تەنها وانە بە موستەعیدەکان دەڵێتەوە، موستەعیدەکانیش وانە بە سوختەکان دەڵێنەوە.

ئەم شێوازە لە فێربوون گرنگییەکی تایبەتی هەیە، خوێندکار لەیەک کاتدا هەم مامۆستایە و هەم خوێندکارە، مامۆستاییەکەی سودێکی زۆری پێدەگەیەنێت بەوەی کە ئەو وانە سەرەتاییانەی کە خوێندوویەتی زیاتر دەچەسپێت و تێیان دەگات، هەروەها سودی لێوەردەگرێت بۆ ئەو وانە نوێیانەی کە لە داهاتوو دەیانخوێنێت. ئەم جۆرە لە فێربوون زۆر بەسودە و لە هیچ لەدامەزراوە فێرکارییە نوێیەکاندا پیادە ناکرێت.

**شەشەم**: خوێندکار لەم جۆرەی خوێندندا لە مزگەوت و حوجرەکاندا دەمێنێتەوە، بەمەش کاتێکی زۆری لەبەردەمدایە بۆ فێربوون و وتنەوە و لەبەرکردن، ئەگەر بەشێوازێکی جوان سەرپەرشتی خوێندکار بکرێت لەم شوێنانەدا دەتوانێت لە ماوەیەکی کەمدا زۆرترین زانیاری وەربگرێت و بەتەواوی قوڵ بێتەوە لە زانستەکاندا.

**حەوتەم**: خوێندکار لەم شێوازە خوێندنەدا زۆربەی کات لە نزیک مزگەتەکاندا دەمێنێتەوە، واتە وابەستەیە بە مزگەوتەوە و پەرستشەکانی لەوێ ئەنجامدەدات و هەندێک جار ئەو بابەتانەی کە دەیانخوێنێت پیادەی دەکات بە پێشنوێژی کردن بێت یان وتاردان یان وەڵامدانەوەی پرسیاری شەرعی یان بەڕێوەبردنی مەراسیمە ئاینییەکان.. هتد، ئەمەش بەشێوەیەکی گشتی لایەنێکی زۆر ئەرێنییە و گونجاوە بۆ ئەم جۆرە خوێندنە. زۆر لایەنی ئەرێنی تر هەن کە دەکرێ لەم شێوازە خوێندنەدا هەبن، ئەمەی باسمان کرد گرنگترینیانن.

لایەنە نەرێنییەکانی خوێندنی ئاینی بەشێوازی کۆن: ئەگەرچی شێوازی کۆن بۆ خوێندنی ئایینی کە زانایانی سەدەی پێشوو لەسەری ڕۆشتوون و ئێستاش لە هەندێک شوێنی جیهانی ئیسلامی و کوردستانیش بەرجەستەیە و پیادە دەکرێت، هەندێک ڕیفۆڕمی بەخۆیەوە بینیوە؛ بەڵام ڕووبەڕووی چەندین ڕەخنەش بۆتەوە کە لێرەدا ئاماژە بە هەندێکیان دەکەم:

**یەکەم**: ئەم شێوازە لە خوێندن بۆ زانستەکان کۆن بووە و بەسەرچووە، ئێستا لە جیهاندا چەندین میتۆد و شێوازی نوێ هاتووەتە کایەوە، چەندین ئامرازی نوێ بۆ فێربوون و فێرکردن بەرهەمهاتوون، ناکرێت شێوازی خوێندنی ئایینی هەر بەوشێوەیە بمێنێتەوە و ڕەچاوی ئەو هەموو پێشکەوتنە جیهانییە نەکات.

**دووەم**: پراکتیکەکردنی زانستەکان لە خوێندنی حوجرەدا لاوازە، لە هەر زانستێک کە خوێندکار دەیخوێنێت نمونەکانی کە فێری دەبێت لە چەند ڕستە و دەستەواژەیەک دەرناچێت وەک(زەید، عەمر، حەیوانی ناتیق، ئەسەد..هتد)، زۆربەی فێرخوازەکان کاتێک پرسیاری هێنانەوەی نمونەیەکی تری لێ دەکەیت بەزەحمەت دەتوانێت ئەو یاسایانەی خوێندوویەتی لەسەر نموونە نوێیەکە جێبەجێی بکات، هەربۆیە دەرچووی ئەم قوتابخانانە لەگەڵ ئەوەی یاساکانی زمانی عەرەبی زۆر بەوردی دەخوێنن و بەشێوەیەکی تیۆری زمانەکە دەزانن؛ بەڵام زۆربەیان لەلایەنی پراکتیکیدا زۆر لاوازن و بەقورسی دەتوانن قسەی پێ بکەن و وتاری پێ بدەن و دانراو و پەڕاوی پێ بنووسن، بە هەمان شێوە لە زانستەکانی تریشدا زۆربەیان لەلایەنە پراکتیکییەکەیدا لاوازن.

**سێیەم**: خوێندنی قوتابخانە کۆنەکان زۆرکات خۆبەخشانەیە، واتە مامۆستا هیچ دەستکەوتێکی نییە لە بەرامبەر ئەو وانانەی کە دەیانڵێتەوە بە خوێندکار، تەنها چاوەڕێی پاداشتی قیامەتییە و ئامانجی ڕەزامەندی خودای گەورەیە و گەیاندنی زانستە، مەبەستیەتی

زانستەکانی خوێندوویەتی لەبیریان نەکات، لەڕاستیدا ئەم خاڵە هەرچەند لەزۆر لایەنەوە زۆر ئەرێنییە و کارێکی مرۆییانەی جوان و سوپاسکراوە؛ بەڵام زۆرکات کارە خۆبەخشییەکان پابەندبوون تیایاندا زەحمەتە و ناتوانرێت لەڕووی جۆرییەوە توندوتۆڵ بکرێت، خۆ ئەگەر مامۆستا موچەیەکی دیاریکراوی هەبوایە هیچ ڕێگر نەدەبوو لە نیەتە جوانەکانی بۆ ئەم کارە و دەبووە پاڵنەرێکی باشتر بۆ بەردەوامبوون و پابەندی زیاتر تەرخانکردنی کاتی زیاتر.

**چوارەم**: ڕەخنەی بەهێز لەم جۆرە خوێندنە ئەوەیە کە ئەم خوێندنە تاقیکردنەوە و هەڵسەنگاندنی تێدا نییە و لە زۆربەی خوێندنگەکاندا لێپرسینەوە پەیڕەو ناکرێت لە فێرخواز، ئاستی تێگەیشتن و کێبڕکێ و دیاریکردنی ئاست بەجێدەهێڵرێت بۆ دوای تەواوبوونی خوێندکار و بوونی بە مەلا و زانای ئایینی، ئەمەش ڕۆحی کێبڕکێ و هاندان لاواز دەکات. هەرچەندە لە کۆندا باشتر بووە، هەفتانە سێشەممان گفتوگۆ و کێبڕکێی زانستییانە لە نێوان حوجرەکاندا بووە و شەڕە پرسیار و شەڕە شیعر و ساغ کردنەوەی عیبارەتەکان هەوێنی کێبڕکێکان بوون، بەمە خوێندار زیاتر هاندراوە بۆ زیاتر وردبوونەوە و فێربوون، بەڵام ئەمە لە هەموو شوێنێکدا نەبووە و ئێستاش ئەم شێوازە بەشێوەیەکی پرۆگرامی لە حوجرەکاندا پەیڕەو ناکرێت.

> **لە دامەزراوە ئاینییە ئەکادیمییەکاندا ڕەچاوی پابەندی ئایینی و ئادابی فێربوونی زانستە ئاینییەکان لە نێوان ماموستا و خوێندکاردا زۆر لاوازە.**

**پێنجەم**: پەیڕەو و پرۆگرامی ئەم خوێندنگایانە تەرکیز لەسەر ساغکردنەوەی دەقەکان دەکات، زۆربەی دەق و کتێبەکانی کە دەخوێنرێت لەم شێوازی خوێندنەدا دەقی قورس و ئاڵۆزن و ئەوەندەی خوێندکار خەریکی ساغکردنەوەیان دەبێت ئەوەندە خەریکی ناوەڕۆکی زانستەکە نابێت، هەربۆیە هەندێک لە خوێندکارەکان فێری ساغکردنەوەی دەقەکان دەبن، بەڵام فێری خودی زانستەکە نابن، مەگەر پاش وتنەوەیەکی زۆر و پیادەکردنی وانە وتنەوە، دیارە هەموو خوێندکارێکیش فرسەتی تەدریس و وانەوتنەوەی بۆ هەڵناکەوێت بۆیە لە قۆناغی مەلایەتیدا هەم دەقەکانی لەبیردەچێتەوە هەم زانستەکەش.

**شەشەم:** لەم شێوازەدا کەمترین هۆکارەکانی فێرکردن بەکاردەهێنرێن، بەتایبەت هۆکارە نوێیەکانی فێرکردن وەک تەختەڕەش و داتاشۆ و وێنە و ئەندازەکان..هتد، هەروەها ڕێگاکانی وانەوتنەوە تەنها یەک ڕێگا بەزۆری پیادە دەکرێت، ئەویش مامۆستا وانەکە هەمووی ڕوون دەکاتەوە و خوێندکار کەمترین بەشداری هەیە لە وانەکەدا، ئەمەش ئەگەر بەتەنها بەکار بهێنرێت بەشێوەیەکی نەرێنی دادەنرێت لە خوێندندا و تەنها ئەو خوێندکارانە زۆر تێدەگەن کە پاشخانێکی مەعریفی باشیان هەیە و هیممەتی فێربوون و گوێگرتنیان بەهێزە. هەرچەندە لەکۆن و نوێشدا هەندێک لە مامۆستایانی ئەم قوتابخانانە ئەم کەلێنەیان پڕکردۆتەوە بەشێوەیەک لەشێوەکان بەڵام لە دنیای ئەمڕۆدا شێوازگەلی زۆر هەن بۆ وانە وتنەوە و ئامرازی فێرکردن و وانە وتنەوە زۆر باش هەن کە لەم قوتابخانانەدا بەکار ناهێنرێن.

**حەوتەم:** لەم شێوازەدا ئەنجامدانی توێژینەوەی زانستی و نووسین بەهەند نەگیراوە، ئەمەش وایکردووە کە فیبرخواز ڕوحی تەقلید و وابەستەبوونی بە ڕای زانایانی پێشیین و ڕێباز و مەزهەبەکەی خۆی لا بەهێز بێت و ئاسۆی بیرکردنەوەی تەسک بێت، تەنانەت ئەو زۆربەی خوێندکارانەی کە بەتەنها دەرچووی ئەم قوتابخانانەن ناتوانن داهێنان و شتی نوێ لە نوسراوەکانیاندا بهێننە کایەوە و کەمترینیشیان دەتوانن کتێب بنووسن و وەرگێڕان بکەن. ڕەنگە ئەگەر ورد ببینەوە بتوانین چەندین لایەنی نەرێنی و ڕەخنەی تری ورد دیاری بکەین؛ بەڵام ئەمانەی باسمان کرد دیارترینیانن.

## لایەنە ئەرێنییەکانی خوێندی ئاینی شێوازی دووەم (شێوازی ئەکادیمی):

دیارە خوێندنی ئایینی لە قوتابخانە ئایینی و زانکۆ و پەیمانگاکانیش چەندین لایەنی ئەرێنی لەخۆدەگرن ئەگەر ئاماژە بەدیارترینیان بکەین خۆیان لەم خاڵانەدا دەبینینەوە:

**یەکەم:** خوێندنی ئایینی بەشێوازی ئەکادیمی لە قوتابخانە و زانکۆکاندا زیاتر جەخت لەسەر لایەنی تێگەیشتنی زانستەکان دەکاتەوە، واتە پرۆگرامەکان بەشێوەیەک ڕەچاو کراوە کە خوێندکار لەماوەی خوێندنیدا زۆرترین زانست وەربگرێت بەبێ گوێدان بە ساغکردنەوەی دەقی کتێبە زانستییەکان، ویستراوە کە ناوەڕۆکی زانستەکان بەکورتی بخوێنرێت و خوێندکار هێڵە پانەکانی زانستەکانی بۆ ڕوون بێتەوە.

**دووەم:** خوێندنی ئایینی بەشێوە ئەکادیمییەکەی ڕەچاوی لایەنی دنیایی و بژێوی تێدا کراوە، واتە هەم خوێندکار هەم مامۆستا پاڵنەرێکی بەرژوەندی هەیە، خوێندکار لە تەواوبووندا بڕوانامەیەکی ئەکادیمی بەدەست دەهێنێت کە بەکەڵکی دێت لە زۆرێک لە

ناوەندە حوکومی ئەهلییەکاندا بۆ دەستەبەرکردنی بژێوی ژیانی، هەروەها مامۆستاش موچەیەکی بۆ تەرخان کراوە کە دەتوانێت بژێوی خۆی پێ دابین بکات، ئەمەش پاڵنەرێکی باشە بۆ بەردەوامی لەم پرۆسەیەدا، دەکرێت ڕێگر نەبێت لە نیەتی باش و ئامانجی بەرزی ئایینی و قیامەتی.

**سێیەم**: لەم شێوازە خوێندنەدا کەم تا زۆر هەڵسەنگاندن و تاقیکردنەوە و کێبڕکێ هەیە، خوێندکار بۆ تاقیکردنەوکان خۆی ئامادە دەکات و هەوڵی دەرچوون دەدات، کەسانی زیرەک و هیممەت بەرزیش هەوڵی باش دەدەن و کێبڕکێ دەکەن، لە ئەنجامدا گریمانە وایە زانستەکان زیاتر ڕەوان بکرێن لەلایەن خوێندکارانەوە، هەرچەندە ئەمەش ڕێژەییە و هەندێ جار وا دەرناچێت. بەڵام ئەگەر پرۆسەکانی هەڵسەنگاندن وەک ئەوەی چاوەڕوان کراوە ئەنجام بدرێت بەرهەمی زیاتری هەیە و لایەنێکی ئەرێنییە بۆ فێربوون و تێگەیشتن.

**چوارەم**: لەم شێوازەدا کۆششی مامۆستا کەمترە بۆ فێرکردن بەوەی کە لە یەک کاتدا ژمارەیەکی زۆر خوێندکار وانەکە دەخوێنن، واتە مامۆستا یەک جار وانەکەی دەڵێت بە چەندین خوێندکار، بەمەش کات و کۆششێکی زۆر دەگەڕێتەوە بۆ مامۆستاکان، ئەگەرچی ئەمەش لەسەر بنەمای جۆرییە لە خوێندندا، بەڵام بەچەندین شێوە هەوڵدراوە قەرەبووی ئەم کەلێنە بکرێتەوە، هەروەها  هەندێک جاریش ئەم خاڵە دەبێتە خاڵی لاواز و نەرێنی ئەگەر ڕێژەی خوێندکارەکان زۆر بوون و وەک پێویست کات بۆ گفتوگۆ و پرسیار و وەڵام تەرخان نەکرا.

**پێنجەم**: تێکەڵی و گەشەپێدانی مرۆیی خوێندکاری ئایینی لە شێوازی خوێندنی ئایینی ئەکادیمی بەهێزترە، واتە خوێندار تێکەڵی دامەزراوە ئەکادیمییەکان دەبێت و ئاشنا دەبێت بە ڕێکارە زانستی و ئەکادیمییەکان بۆ فێربوون و فێرکردن و بەهۆی مامەڵە لەگەڵ زۆرترین خوێندکار و مامۆستادا، کە ڕەنگە بیرکردنەوەی هەندێکیان جیاواز بێت لە بیرکردنەوەی ئەو، بەمەش ئاسۆی بیرکرنەوەی خوێندکار فراوانتر دەبێت دەتوانێت ڕا جیاوەزەکان بە شێوەیەکی ئاسایی وەربگرێت و مامەڵەیان لەگەڵدا بکات.

**شەشەم**:  ئامرازەکانی فێرکردن فەراهەمن لەم شێوازە خوێندنەدا و خوێندکار زووتر لە بابەتەکان تێدەگات، چونکە زۆربەی هەستەوەرەکانی بەشدار دەبن لە فێربووندا.

## لایەنە نەرێنییەکانی خوێندنی ئایینی بەشێوەی ئەکادیمی:

ئەگەر ئاماژە بە هەندیک لایەنی نەرێنیش بدەین، دەتوانین بڵێین کە ئەو لایەنەش خۆی لەم خاڵانەدا دەبینێتەوە:

**یەکەم**: خوێندن بەم شێوازە خوێندکار پەرت دەکات، بەوەی لەیەک کاتدا چەند زانستێک بەیەکەوە دەخوێنێت کە پەیوەندییان بەیەکترەوە کەمە، هیچیان بەقوڵی ناخوێنێت و تەنها سەرەتایەک وەردەگرێت لەبارەیانەوە، بەم شێوەیە خوێندکار قوڵ نابێتەوە لە هیچ یەکێک لەو زانستانەی کە دەیانخوێنێت و ناتوانێت داهێنان و ڕادۆزی بکات لە زانستەکاندا.

**دووەم**: خوێندکار لەم شێوازەدا پرۆگرامی زۆرێک لە وانەکان تەواو ناکات، بەهۆی دیاریکردنی کاتی خوێندن و تاقیکردنەوەکان زۆرکات لە هەندێ زانستدا زۆر بابەت بەجێ دەهێڵێت و لە قۆناغی داهاتووشدا ناچێتەوە سەری، بەمەش زانیاییەکانی لەو زانست و وانانەدا کەم و کورت دەبێت.

**سێیەم**: میتۆد و پرۆگرامی خوێندن لەم جۆرە خوێندنەدا زۆرکات –بەتایبەت لە زانکۆدا– گۆڕاو و دیارینەکراوە هەندێک جار لەهەندێ وانەدا مامۆستا پرۆگرامەکەی کورت دەکاتەوە لە چەند لاپەڕەیەک و خوێندکاران کۆپی دەکەن و لەسەری دەخوێنن، ئەمەش دەیانپچڕێنێت لە کتێبە ڕەسەنەکانی زانستە ئیسلامییەکان و ئاشنایەتییان لەگەڵ کتێبە زانستییەکان کەم دەکاتەوە.

**چوارەم**: ئەو دامەزراوە فێرکارییە ئایینیانەی کە سەر بە دەوڵەتن و بەشێوازی ئەکادیمی وانە دەخوێنن زۆر کات لە ڕێنمایی و وانە گشتێنراوەکاندا جیاوازیان پێناکرێت لەگەڵ دامەزراوە فێرکارییە گشتییەکاندا، واتە تایبەتمەندیی ئەم دامەزراوانە پارێزراو نییە هەم لەڕووی ئاینییەوە هەم لەڕووی میتۆد و پرۆگرامەوە، بۆ نمونە لە خوێندنی ماستەر و دکتۆرادا چۆن کۆلێجەکانی زانست و زمان داوای بڕوانامەی لێهاتوویی زمانی ئینگلیزییان لێ دەکرێت بەهەمان شێوە کۆلێجی زانستە ئیسلامییەکانیش داوایان لێ دەکرێت، کە لەڕاستیدا گرنگی زمانی عەرەبی بۆ ئەم کۆلێجە لەپێشترە وەک زمانی ئینگلیزی، بەڵام ڕێنماییەکان بەم شێوەیە گشتگیر دەکرێت بۆ تەواوی کۆلێجەکانی زانکۆ، هەروەها لە ڕێنمایی تریشدا بەم شێوەیە تایبەتمەندی ئەم دامەزراوانە ناپارازرێت.

**پێنجەم**: زۆربەی خوێندکارانی خوێندنی ئایینی ئەکادیمی کاتێک کە دێنە کۆلێجە ئاینییەکان لە قوتابخانە گشتییەکانەوە دێن، واتە زانیارییان زۆر لاوازە لەسەر زانستە ئیسلامییەکان و زاراوەکانی، دەرەنجام لەم کۆلێجانەدا زۆر کەمیان دەتوانن ببنە زانا و زانستە ئاینییەکان بەتەواوی فێرببن، جگە لەوەش تێکەڵیش دەکرێن لەگەڵ ئەو خوێندکارانەی کە لە قوتابخانە ئاینییەکانەوە هاتوون بەمەش خوێندکارەکان دەبنە دوو جۆر کە مامۆستا ناتوانێت بە یەک میتۆد وانە بەهەموویان بڵێتەوە.

**شەشەم**: لە دامەزراوە ئاینییە ئەکادیمییەکاندا ڕەچاوی پابەندی ئایینی و ئادابی فێربوونی زانستە ئاینییەکان لە نێوان مامۆستا و خوێندکاردا زۆر لاوازە، واتە خوێندکار لە پۆشینی جلوبەرگدا ئازادە و مەرج نییە داپۆشراو بێت، هەروەها زۆرکات خوێندکارانی کوڕو کچ تێکەڵ دەکرێن و هەندێک جار لە پەنا یەک دادەنرێن ..هتد، ئەم شێوازانەش نەشیاوە بۆ خوێندنی ئایینی و ڕێگە پێدراو نیە و لەگەڵ ئادابەکانی فێربوونی زانستە ئاینییەکاندا ناگونجێت. هەروەها ئادابی خوێندنی زانستە ئیسلامییەکان کە لەکۆنەوە ڕەچاوکراوە لە نێوان مامۆستا و خوێندکار لەم جۆرەی خوێندندا ڕەچاو ناکرێت کە دواجار بەنەرێنی دەشکێتەوە و جۆرێک لە خوێندکار پەروەردە دەبن کە ڕەچاوی پلەبەندی زانستی ناکەن و ڕێز لە زانایانی پێشین ناگرن.

**حەوتەم**: خوێندکار لەم دامەزراوانەدا فێری زمانی عەرەبی نابێت کە سەرچاوەی مەعریفی سەرەکییە بۆ زانستە ئیسلامییەکان، بەمەش کەسێکی قووڵ پەروەردە نابێت لە زانستە ئیسلامییەکاندا و ناتوانێت قوڵ بێتەوە و زانستەکان پیادە بکات. هەربۆیە دەبینین خوێندن بەم شێوازە بەرهەمدار نەبووە، لەواقعدا دەبینین دەرچووی ئەم قوتابخانە و کۆلێج و دامەزراوانە ئەگەر هەر لەو دامەزراوانە خوێندبێتی ئەوا ئاستی زانستی زۆر لاوازە، لە زانستە شەرعی و زمانەوانییەکاندا لەدواوەوەیە.

**هەشتەم**: دەوڵەت کەمترین گرنگی دەدات بەم دامەزراوە فێرکارییانە، بەزۆری ئەو خوێندکارانە لەم دامەزراوانە وەردەگیرێن کە کەمترین نمرەیان بەدەستهێناوە و لە شوێنی تر وەرناگیرێن، بەناچاری دێنە ئەم دامەزراوانە، ئەمەش کوالیتی ئەم جۆرە خوێندنە دادەبەزێنێت، زۆربەی خوێندکارە لاواز و بیرکۆڵەکان دەبنە کێشە بۆ دامەزراوەکان و لە داهاتووشدا زانای باش و خوێندەوار دەرناچن، هەروەها لەم شێوازە خوێندنەدا سیاسەت و دەوڵەت زۆرترین دەستێوەردان دەکەن و هەندێک میتۆد و پرۆگرام دەچەسپێنن کە ڕەنگە خزمەت بە زانستەکان نەکات؛ بەڵکوو تەنها ئامانجی سیاسی لەپشتەوە بێت. ئەمانە و چەندین کێشە و لایەنی نەرێنی تر هەن کە کاریگەرییان هەیە لەسەر خوێندنی ئاینی بەم شێوازە.

## چۆنیەتی دەرباز بوون لە کێشەو گرفتەکانی خوێندنی ئاینی ونوێگەری تیایدا:

وەک ئاماژەمان پێدا و بۆمان ڕوونبوویەوە هیچ کام لەم دوو شێوازەی فێربوون و خوێندنی ئایینی خاڵی نین لە لایەنی نەرێنی و کەم و کوڕی و لایەنی ئەرێنی و باش، لێرەدا بەپێویستی دەزانم ئاماژە بە هەندێک پێشنیاز بکەم بۆ بەرەوپێشبردنی ڕەوشی خوێندنی ئایینی نوێکردنەوەیی و هەستاندنەوەیەکی جۆری تیایدا، تا کۆمەڵگە لە زانستەکانی سودمەند بێت و ئایین لە جێگە شایستەکەی خۆیدا بەرجەستە بکرێت و زانستەکانی ڕێز لێگیراو و خزمەتکراو بێت:

**یەکەم**: هەوڵ بدرێت ئەم دوو شێوازەی خوێندن تێکەڵ بکرێت و ڕێکار و ئامراز و ڕێنمایی پێویستی بۆ بدۆزرێتەوە، چونکە وەک ئاماژەمان پێدا هیچ کام لەم دوو شێوازە خاڵی نەبوون لەلایەنی ئەرێنی و نەرێنی، بۆیە ئەگەر بە شێوازێکی گونجاو لایەنە ئەرێنییەکانی هەردوو شێوازەکە ڕەچاو بکرێت لە شێوازێکی نوێدا دەکرێت بازێکی گەورە بە نوێکردنەوەی خوێندنی ئایینی بدات.

**دووەم**: پێویستە حوجرەکان وەک خۆیان بمێننەوە، لەلایەن دامەزراوەیەکەوە سەرپەرشتی بکرێن و بەدواداچوونی پێویست بۆ پێداویستی و مامۆستا و خوێندکارەکانی بکرێت و پرۆگرامی پێویستیان بۆ دابنرێت و لە هەندێک قۆناغدا تاقیکردنەوەی دەرەکیی بۆ خوێندکارەکانیان ئەنجام بدرێت و ئەگەر خوێندکار لەو تاقیکردنەوانە نمرەی پێویستی هێنا لە کۆلێجە ئایینییەکان وەربگیرێت.

**سێیەم**: ڕێگە بدرێت بە کردنەوەی حوجرە و خوێندنگەی ئایینی مزگەوتەکان بە ڕێکار و ڕینمایی پێوست و گونجاو، تەنها ڕێگە بەو مامۆستایانە بدرێت کە ئەم جۆرە خوێندنگانە بکەنەوە کە زانای شایستەن و دەتوانن زانستە شەرعییەکان بەڕەوانی بڵێنەوە، دەکرێ ئەمەش لەڕێی هەڵسەنگاندن و تاقیکردنەوەوە بێت لەلایەن لیژنەیەکی پسپۆڕی تایبەت.

**چوارەم**: پێداویستییە ماددیی و لۆجیکییەکانی خوێندنگەی حوجرەکان دابین بکرێت بەشێوەیەکی شایستە و گونجاو، هەوڵ بدرێت موچەی شایستە بۆ مامۆستاکان فەراهەم بکرێت.

**پێنجەم**: خوێندکار تەنها لەم حوجرە و خوێندنگایانەوە وەربگیرێن لە کۆلێج و پەیمانگا ئایینییەکان بۆئەوەی ئاستی کۆلیجە ئایینییەکان بەرز بن و بتوانن قوڵ ببنەوە لە زانستەکاندا. ئەگەر خوێندکارێکی خوێندنگە گشتییەکان ویستی لەم کۆلێجانە وەربگیرێت و تاقیکردنەوە هەڵسەنگاندنی بۆ بکرێت، ئەگەر پێویست بوو ساڵێک خوێندنی ئامادەکاری بۆ دابنرێت پاشان وەربگیرێت، ئەویش لە هەموو بەشەکاندا ئەم ئاسانکارییە نەکرێت.

سەبارەت بە کچان ئەگەر حەز بە خوێندنی ئایینی بکەن دەکرێت خوێندنگەی ئایینی تایبەتیان بۆ بکرێتەوە لەسەر ڕێبازی حوجرەکان و زانستەکانی بە جوانی تێدا بخوێنرێت، بەپێی ڕێنمایی پێویست لە کۆلێج و پەیمانگا ئایینییەکان وەربگیرێن. هەروەها دەکرێت بەشێک لە کۆلێجەکان تایبەت بکرێت تەنها بەو خوێندکارانەی کە ئاستیان زۆر بەرز نییە لە کوڕان و کچان، کە تیایدا تەنها ڕۆشنبیری ئیسلامیی و فیکر و بانگەوازی ئیسلامی بخوێنن و قوڵ نەبنەوە لە زانستە ئیسلامییەکان.

**شەشەم**: لیژنەیەکی دوور لە سیاسەت و حیزبایەتی و پسپۆڕ پێداچوونەوە بۆ پرۆگرامی حوجرەکان بکات و هەندێک لەو وانە پێویستانەی بۆ زیاد بکرێت کە لە

خوێندنگه گشتییەکاندا دەخوێنرێت. پاشان ئەم پرۆگرامە گشتگیر بکرێت لە تەواوی حوجرە و خوێندنگە ئاینییەکاندا.

**حەوتەم**: لە هەموو دامەزراوە ئاینییەکاندا تەنها ڕێبازێکی فیقهی بەتەواوی بخوێنرێت و هەندێک وانەی بەراوردکاری هەبێت کە لە نێوان ئەو ڕێبازە و ڕێبازە فیقهییەکانی تردا بەراورد بکات. بۆ نموونە لە کوردستاندا تەنها ڕێبازی ئیمامی شافعی بخوێندرێت و وانەی بەراوردکاریش هەبێت لە نێوان ئەم ڕێبازە و ڕێبازەکانی تردا.

**هەشتەم**: گرنگی تەواو بدرێت بە وانەکانی بەها و فیکری ئیسلامی و چەسپاندنی بیری میانڕەوی و قبوڵکردنی یەکتر و جیاوازییەکان و ڕەواندنەوەی دەمارگیریی و توندئاژوویی لە تەواوی پرۆگرام و ڕێکارەکاندا.

**نۆیەم**: سودوەرگرتن لە کەلەپووری گەلانی تر بۆ بەرەو پێشبردنی زیاتری ئەم جۆرە خوێندنە و ئەنجامدانی گەشتی زانستی بە مامۆستا و خوێندکارەکان بۆ وڵاتان بۆ فراوانکردنی ئاسۆی تێڕوانین و بیرکردنەوەیان. هەروەها خولی پێویست بکرێتەوە بۆ مامۆستای حوجرە و خوێندنگە ئاینییەکان بۆ چۆنیەتی بەکارهێنانی ئامرازە فێرکارییەکان و ئاشناکردنیان بە ڕێگاکانی وانەوتنەوە هاوچەرخەکان.

**دەیەم**: دەبێت دەوڵەت مەبەستی بێت و گرنگی بەو لایەنە لە خوێندن بدات، بۆئەوەی ئەوانەی خولیای ئەم جۆرە خوێندنەن بەملاولادا نەڕۆن و پەرگیریی و کەمترخەمی دروست نەبیت لە پیادەکردنی ئایینی کۆمەڵگە، هەلی کاریان بەشێوەیەکی شایستە بۆ فەراهەم بکات، چونکە دەرچووی ئەم دامەزراوانە ئەگەر ببن بە مامۆستای ئایینی دەتوانن گەلێک کێشەی کۆمەڵایەتی و بەرپرسیارێتی لە کۆڵ دەوڵەت بکەنەوە، هەروەها ئەگەر بشبن بە مامۆستا لە قوتابخانە گشتییەکاندا ئەوا دەتوانن وانەکانی ئایین و بەهاکان و زمانی عەرەبیش لە خوێندنگە گشتییەکاندا بەشێوەیەکی شایستەتر بڵێنەوە و کەلێنێکی گەورە پڕ بکەنەوە. ئەمانە و چەندین پێشنیازی تر هەن کە دەکرێت ڕەچاو بکرێن بۆ بەرەپێشبردنی ڕەوتی خوێندنی ئایینی و بەرزکردنەوەی ئاستی زانستی و دنیابینی زانایان و خوێندکارانی ئایینی و بەهێزکردنی ڕۆڵ و کاریگەری زانایانی ئایینی و گێڕانەوەی ئەو ڕۆڵە بەهێز و شایستەیی کە هەیانبووە لە ڕابردوودا.

لەکۆتاییدا، ئەمانەی کە نوسیوەمە زۆربەی زادەی تێڕامان و وردبوونەوەی بەندەیە بۆ ئەم بابەتە کە خۆم هەردوو شێوازەکەیم پیادەکردووە، سەرنجم بۆ دروست بووە لەسەر هەردوو شێوازەکە، ئەگەر کەم و کوڕی هەبێت لە تێڕوانینەکانمدا یان تێپەڕاندنێکم هەبێت لە بۆچوونەکانمدا ئەوا داوای لێبوردن دەکەم، هیوام وایە بە هەمووما‌ن بتوانین ڕێبازی ئەم جۆرەی خوێندن دەوڵەمەند و بەرەوپێش ببەین.

# سەرچاوەکان

ئەگەرچی ئەوەی نوسیومە زۆربەی زادەی بیرکردنەوە و ئەزموونی خۆمە کە هەم شێوازی کۆنی خوێندنی ئاینیم پیادەکردووە و هەم شێوازی ئەکادیمی ئەم جۆرە خوێندنەشم تەواوکردووە؛ بەڵام بۆ ئەم بابەتەش سودم لەم دوو سەرچاویەش وەرگرتووە:

١. د. خالد الصمدي و د.عبد الرحمن حللي: أزمة التعليم الديني في العالم الإسلامي، دار الفكر، الطبعة الأولى ، ٢٠٠٧م.

٢. د. طه جابر العلواني: التعليم الديني بين التجديد والتجميد، منشور على شبكة الأنترنيت.



**پ. د. حەسەن خالید موستەفا موفتی**
پرۆفیسۆر لە زانکۆی سەڵاحەدین، سەرۆکی ئەنجومەنی باڵای فەتوا لە کوردستان.

# جیاوازییەکانی خوێندنی فەقێیەتی سەردەمی زێڕین لە کوردستاندا

## بە بەراوورد لەگەڵ خوێندنی ئەم سەردەمەی ئەکادیمی



# پێشەکی:

خوێندنی فەقێیەتی  لە کوردستاندا سەرەتاکانی بەشێوازێکی گشتی دەگەڕێتەوە بۆ چەرخی خیلافەتی عەبباسییەکان، ڕەنگە پێشتریش بوونی هەبووبێت، بەڵام بەپێی سەرچاوەکان و قوتابخانە گەورەکانی وەک دینەوەر و ئامەد و شارەزوور و ئەربیل و ڕەها و ئۆرفا و ماوەران و ..هتد، هەروەها بەپێی زنجیرەی زانایانی کوردی بنەماڵە گەورەکانی وەک: حەیدەرییەکان و شارەزوورییەکان و  شەجەرەی زانستی بڕوانامە زانستییەکانی وەک: شەجەرەی خەرپانی و نۆدێی و سەنەندەجی و قەرەداغی و باڵەکی و بیارە و شنۆیی و نمونەکانیان لە مێژە کورد و کوردستانیان گرنگییان داوە بە خوێندن و خوێندەواریی و ڕۆشنبیری بە جۆرێک کە ڕەنگە لە پێشینەی زۆرێک لە نەتەوە مسوڵمانەکانی ترەوە بووبن و تا ئێستای هەر لە پێشینەدا بن، لەگەڵ ئەو هەموو ستەم و وێرانکارییانەی کە هێنرا بە سەریاندا بەتایبەت لە سەدەکانی نۆزدە و بیست و یەک دا.

هەربۆیە لە پێشتردا گوتم ڕەنگە مێژووی مەدرەسەکانی کوردستان بگەڕێتەوە سەردەمی پێش عەبباسییەکان، واتە: سەردەمی ئەمەوییەکان، چونکە لەوکاتانەدا بەهۆی بارودۆخی ناجێگیر و ستەمی هەندێک لە دەسەڵاتدارانی ئەوکات کۆچی زانا بەرزەکانی ئال و بەیتی حەزرەتی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) بەرەو کوردستان دەستیپێکردووە، ئاشکراشە لەنێو ئال و بەیتی ئەو نازدارەشدا (د.خ) زۆرێک لە ساداتی زانا هەبوون و بوونیان لەنێو کوردەکاندا - پاش ژن و ژنخوازی - زۆر کاریگەر بووە بۆ برەودان بە خوێندن و بڵاوبوونەوەی عیلم و عیرفان و تەصەووف لە سەرجەم شوێنەکانی کوردستاندا، بەنموونە ئیمام حەمزەی تەکیێ قەرەداغ (ڕ.خ) کە دەکاتە باپیرە گەورەی بنەماڵەی شێخ عەبدوڵڵای خەرپانی ئیمەیە و لە ناوچەی هەڵەبجەدا بوون، ئەم زاتە - کوڕی ئیمام موسای کازم بووە و لە گوندی تەکیێ قەرەداغی نیشتەجێ بووە و مەدرەسەیەکی گەورەی دروستکردووە بۆ نەشری عیلم و عیرفان و پاشان نەوەکانی یەک لە دوای یەک ئەهلی عیلم و عیرفان بوون و تەدریس و قەزا و فەتوایان پێ سپێردراوە و هەتا ئەمڕۆیش (سوپاس بۆ خودا) هەر بەوشێوە لە خزمەتکردندان، واتە: ئەم بنەماڵە زانستییە گەورە لە زنجیرەی شەجەرەی پاکی ساداتن کە لە چەرخی ئەمەوییەکانەوە نیشتەجێی کوردستان بوون بۆ ئەو مەبەستە پیرۆزە. جگە لەوانیش بنەماڵەی (أبو الوفا) ی نەرجسی کە مامۆستای شێخی گەیلانی بووە و لە گوندی نێرگسەجاڕی ناوچەی ڕۆژئاوای هەڵەبجەدا جێگیر بوون، هەروەها پاشتریش بنەماڵەی بەرزنجی(شێخ عیسا و

شێخ موسی) کە لە ساداتن لە ناوچەی ڕۆژهەڵاتی سلێمانیدا نیشتەجێ بوون، تێکڕایان خزمەتیان بە حوجرە و عیلم و عیرفان کردووە.

هۆکاری پابەندبوونی میللەتی کورد بە فەقێیەتی و خزمەتکردنی مەدرەسە و مەلای چاک و شێخانی ڕاستەقینەی تەریقەت و تەصەووف، دەگەڕێتەوە بۆ پابەندبوونیان بە خواهیشتی و ئیختیاری خۆیان بە ئایینی پیرۆزی ئیسلامەوە و هەر لە ساڵەکانی پێش بیستی کۆچییەوە کە خوای میهرەبان ئەم میللەتەی ئاشنا کرد بەو ئایینە، وەک لە سەرەتاکانی کتێبی (إعلان استقلال كردستان وحقوق الأمه الكوردية فی نظر الشريعة الإسلامية)دا بە سەرچاوەی دروست ڕوونمان کردووەتەوە.

هەروەها خۆشەویستییان بۆ فەقێ و مەلا و سادات بۆ گوێڕایەڵییانە بەو هەموو دەقەی کە لە قورئان و سوننەتدا هاتووە لەوبارەوە، لەوانەش ئایەتی پیرۆزی: **{فَلَوْلَا نَفَرَ مِنْ كُلِّ فِرْقَةٍ مِنْهُمْ طَائِفَةٌ لِيَتَفَقَّهُوا فِي الدِّينِ وَلِيُنْذِرُوا قَوْمَهُمْ إِذَا رَجَعُوا إِلَيْهِمْ لَعَلَّهُمْ يَحْذَرُونَ}** (سورەتی التوبة: لە ئایەتی ١٢٢)، هەروەها فەرموودەی جوان و دروستی: «من يرد الله به خيرا يفقهه فی الدين» (متفق عليه من حديث معاويه بن أبی سفيان(رضی الله عنهما) صحيح البخاری (١٠٣/٤) برقم (٣١١٦)، صحيح مسلم (٩٥/٣) برقم (٢٤٣٩): هەروەها فەرمودەی دروستی: «من سلك طريقا يلتمس منه علما سهل الله له طريقا إلى الجنة»، (رواه الترمذی فی سننه عن أبی هريرة (رضی الله عنه):(٣٢٥/٤) برقم(٢٦٤٦). هاوشێوەکانی ئەم فەرموودانە کە هانی موسڵمانان دەدات بۆ فێربوون بە گشتی و خوێندنی فەقێیەتی و زانستە شەرعییەکان بەتایبەتی.

بە پێویستم زانی لەم توێژینەوە کورتەدا تیشک بخەمە سەر لایەنە پرشنگدارەکانی خوێندنی فەقێیەتی بە بەراورد لەگەڵ خوێندنی ئەکادیمی ئەمڕۆدا لە بەر سێ خاڵی سەرەکی کە ئامانجی ئەم توێژینەوەیە:

**خاڵی یەکەم:** فەقێی حوجرەی ڕەسەن سەر بەرز بێت بە ڕابردووی پرۆسەی خوێندنی خۆی و هەرگیز خوێندنی ئەمڕۆی ئەکادیمی نەکاتە بەدیلی خوێندنی حوجرە، چونکە بەداخەوە خەریکە هەندێک نەفام بە عاری تێبگات باس لە فەقێیەتی بکات، یان شەهادەیەکی بێ ناوەرۆکی لابەلای هێنابێتەوە و فەخری بەسەرەو بکات، یان هەندێک نا بەرپرس خوێندنی ئەکادیمی گەورەتر تەماشا و وێنا بکات لە خوێندنی فەقێیەتی، عەجایبیش نییە، چونکە وەک گوتراوە (المرو عدو لما جهل)!

**خاڵی دووەم:** تا ئەوانەی لە بواری ئەکادیمیدا کار دەکەن زۆر فەخر نەکەن بەو پرۆسەی کە لە بەردەستیاندایە و دەیبوێرن، چونکە کەموکوڕی یەکجار کوشندەی تێدایە و پێویستی بە چاکسازییە.

**خاڵی سێیەم:** بابەتی هەردوو شێوازی خوێندن لە ئێستادا (مانعە الجمع) نییە، واتە خوێندکار بەتایبەت بەشە ئیسلامییەکان دەتوانن هەردوو شێوازی خوێندنی فەقێیەتی و خوێندنی ئەکادیمی کۆبکەنەوە و خاڵە ئەرێنییە بەهێزەکانی هەردوو پرۆسەکە لە یەکتر بدەن تا زیاتر سەرکەوتووبن، لە بنچینە و وردەکاری و ناوەرۆکدا فەقێ بن، و لە هەندێ بابەت و ڕووکەش و بۆ دونیایش ئەکادیمی، چونکە ڕۆژگارەکە وا دەخوازێت سود لە یەکتر وەربگیرێت.

پاش ئەم پێشەکییە گرنگە، پێویستە باس لە وەڵامی ئەو پرسیارە بکەین کە زۆرجار دەکرێت و دەپرسن: ئایا بۆ ئاستی خوێندنی ئەمڕۆی ئەکادیمی بە بەراورد لەگەڵ خوێندنی ئەوسای فەقێیایەتی یەکجار دابەزیوە؟ بۆچی ئاستی قوتابخانە ئەکادیمییەکان هێندە دابەزیوە، بە جۆرێک ئەگەر فەقێیەکی سوختەی ئەوسا بکەوێتە مەیدانەوە بە پێنج دەرچووی کولێژی ئێستا دەرەقەتی زانستەکەی نایەن؟ ئایا خەتا لە شێوازی خوێندنە، یان پرۆگرامی خوێندن، یان مامۆستاکان؟ یان خودی قوتابییەکان؟ یان پلانی دەزگا پەیوەندارەکان لە هەرسێ وەزارەتی پەروەردە و خوێندنی باڵا و ئەوقاف؟

لە وەڵامدا دەڵێین: بە حوکمی ئەوەی بەندە هەم خوێندنی فەقێیەتیم تا وەدەستهێنانی بڕوانامەی زانستی سوپاس بۆ خوا تەواوکردووە لە خزمەت هەردوو زانای دیاری کوردستان مامۆستا مەلا عەبدولکەریمی مودەڕیس و جەنابی باوکم مامۆستا شێخ خالیدی موفتی هەڵەبجە، هەم خوێندنی ئەکادیمیشم ئەنجامداوە تا بەدەستهێنانی بڕوانامەی دکتۆرا و پلەی پرۆفیسۆری لە زانکۆی سەلاحەددین لە هەولێر، بەو حوکمە دەتوانم بڵێم: بەڵێ بەداخەوە هەموو دانشمەندێک ئەمڕۆ هەست بەوە دەکات کە پرۆسەی خوێندن نەک بە بەراورد لەگەڵ حوجرەی ئەوسا ئاسمان و ڕێسمانە، بەڵکو پرۆسەی خوێندنی ئەکادیمیش بە بەراورد لەگەڵ (٣٠)سی ساڵ لەمەوبەردا یەکجار جیاوازی هەیە و بەردەوام لە پاشەکشێدایە بۆ خراپ و خراپتریش، بەڵکو خراپترینیش بەڕێوەیە ئەگەر چارەسەری بنەڕەتی نەکرێت لەلایەن دەزگا پەیوەندارەکان لەلایەک و خودی قوتابی و مامۆستایان لەلایەکی ترەوە.

ئێمە لێرەدا باس لە بەشە زانستییەکانی وەک فیزیا و کیمیا و زیندەوەرزانی ناکەین کە ئەوانیش هەر لە پاشەکشێدان وەک خۆیان دەیڵێن، بەڵکو باس لە جیاوازی گەورە دەکەین لە بەشەکانی زانستی ئیسلامی لە کۆلێژەکان و پەیمانگا و قوتابخانەکانە ئیسلامییە ئەکادیمییانە دەکەین بە بەراورد لەگەڵ حوجرەی سەردەمی زێڕینی ئەوسای خوێندنی حوجرە و فەقێیایەتی. بۆیە دەتوانین گرنگترین ئەو جیاوازییانە بەم شێوەیە پۆلین و خاڵبەندی بۆ بکەین بەمەبەستی ئاشنا بوون و وەبیرخستنەوە و چارەسەرکردنیان بەم پێیەی لای خوارەوە:

**جیاوازی یەکەم: لەڕووی ئیخڵاس و تەقوادا**

حوجرەی مزگەوت و خانەقاکانی کوردستان بە ئەوپەڕی ئیخڵاس و لە خواترسانەوە دەستیان دەکرد بە پرۆسەی خوێندن و هیچ مەرامێکی دونیاییان نەبوو جگە لە ئاشنابوون بە زانستە شەرعییەکان و سودگەیاندن بە موسڵمانان، ئەم سیما جوانە زۆر بە دەگمەن بەدی دەکرێت بەداخەوە لە خوێندنی ئەکادیمی ئەمڕۆدا، چ لە قوتابیان و چ لە مامۆستایان و چ لە دانەری پرۆگرام و سەرچاوەکان، مامۆستا مەلا عەبدولکەریمی مودەڕیسی بیارە (ر.خ) بۆی گێڕاینەوە لە بەغدا لە سەرەتای نەوەدەکانی سەدەی پێشوودا و فەرمووی:» هەرکاتێک سەرم دەئێشی یان کێشە و خەفەتێک ڕووم تێ دەکات، دەست دەبەم یەکێ لەو کتێبە پەڕە زەردانەی وەک جامی و ئیزهارو کافیە و سیوتی دەگرم بە دەستمەوە و پەڕەیەکی لێ دەخوێنمەوە، یەکسەر خودا شیفام ئەدات بە بەرەکەتی ئیخڵاسی دانەری کتێبەکانەوە خوا دەرەجاتیان عالی بکات». هەروەها مامۆستاش بۆ پارەی موحازەرات و شوهرەتی دونیایی و ڕیئاسەت دەرسی نەدەگوتەوە، بەڵکو تەنها و تەنها لە بەر ڕەزامەندی خودا بوو.

**جیاوازی دووەم: لەڕووی ئامانج و مەبەستەکانەوە**

تەنها ئامانجی فەقێ لە کاتی خۆیدا ئەوەبوو کە خوێندنەکەی تەواو بکات و خزمەت بگەیێنێت بە ئیسلام و موسڵمانان، بەڵام زۆربەی زۆری خوێندنی ئێستا بۆ بەدەستهێنانی بڕوانامە و بەهۆیەوە پێی دابمەزرێن و ژیانی خۆی دابین بکات!

**جیاوازی سێیەم: لەڕووی هیممەتی قوتابی و هیممەتی مامۆستایانیشەوە**

فەقێ لە حوجرەدا هەروەها مامۆستاکەی هیممەتێکی یەکجار گەورە و ناوازەیان هەبوو لە فێربوون و فێرکردن، ماندوونەناسانە پرۆسەکەیان دەبرد بەڕێوە و هیچ تەمەڵی و ماندووبوونیان پێوە دیار نەبوو، بەپێچەوانەی زۆربەی زۆری خوێندکار و مامۆستای قوتابخانە و پەیمانگا و کۆلێژەکانی ئەمڕۆ کە هیممەتیان بۆ زانست و فێربوون نییە.

**جیاوازی چوارەم: لەڕووی پرۆگرامەوە**

پرۆگرامی خوێندنی فەقێیەتی زادەی ئەزمونێکی یەکجار بەرز و پیرۆزی چەندین سەدەی شارستانی ئیسلامی بوو، کە بەهۆیەوە لە ماوەیەکی قیاسیدا فەقێ دەبوویە موستەعید و پاشان دەبوویە زانایەکی هەڵکەوتەی بلیمەت کە کۆی ساڵەکانی لە (١٠)دە ساڵ تێنەدەپەڕی، بەڵام پرۆگرامەکانی خوێندی ئەکادیمی ئەمڕۆ لایەنی کەم (١٦)شازدە ساڵی پێ دەچێت ئەگەر خوێندنی باڵایشی بخەیتە سەر دەچێتە زیاتر لە (٢٠) بیست ساڵ، کەچی دەرچووەکەش شتێکی ئەوتۆ فێر نابێت، تەنانەت زۆرێک لە دەرچووانی کولێژ ناتوانێت بەتەواوەتی دارشتنێکی بە هێز و بە پێز بە عەرەبی یان بە کوردیش بنوسێت!

**جیاوازی پێنجەم: لەڕووی شێوازی وانە گوتنەوەوە**

لە خوێندنی فەقێیایەتیدا وانەکان بەپێی تێگەیشتنی قوتابییەکە بوو، واتە: هەتا ئەو فەقێیە بە جوانی حاڵی نەبوایە لەو وانانەی ئەو ڕۆژەی ماموستاکە هەر دەمایەوە لەگەڵیدا و گوێی نەدەدایە کاتژمێر، بەپێچەوانەی قوتابی نێو قوتابخانە ئەکادیمییەکان کە هەروەک زۆربەیان حاڵی نابن لە وانەکە، هێشتا دە دەقیقەی دەمێنێت بۆ تەواوبوونی خێرا بە بێئەدەبی دەیکەنە غەڵبەغەڵب و دەڵێن ماموستا کاتەکەت تەواو بووە! بۆیە حاڵی زانستییان ئاوا جوانە!

**جیاوازی شەشەم: لەڕووی ئادابی وانەگوتنەوە**

لە حوجرەدا فەقێ و ماموستاکەی کە دەست دەکەن بە وانەکە بە (ناوی خودا و ستایشی خودا و سەڵات و سەلام لە سەر گیانی حەزرەتی پێشەوا و یار و یاوەرانی (د.خ) ڕۆژانە دەست پێ دەکەن، لە پێشەکی و کۆتایی هەر کتێبێکیشدا فاتیحایەک ڕەوانەی ڕۆحی حەزرەتی پێغەمبەر (د.خ) و ئال و ئەسحاب و زانایانی ئیسلام بە گشتی و ڕۆحی دانەری کتێبەکە بەتایبەتی دەکەن، لە سەرەتای هەموو وانەیەکیشدا فەقێکە دەیگوتە ماموستاکەی: (بارک الله فی جمیع مقاصدک) ماموستاکەیش دەیگووت فەقێیکەی: (إیانا وإیاکم)، لە کۆتایی هەموو دەرسێکیشدا فەقێکە دەیگووت بە ماموستاکەی (رحمە الله علیکم)، ماموستاکەیش لە وەڵامیدا دەیفەموو: (علینا وعلیکم)، بۆیە وانەکان بەرەکەتی هەبوو، بەڵام کوا ئەو ئەدەب و ئەرکانە لە خوێندنی ئەکادیمیدا؟

**جیاوازی حەوتەم: لەڕووی سەرقاڵی بە (مالا یعنی) و بێ بەهاوە**

لە خوێندنی فەقێیەتیدا هەرگیز فەقێ خۆی خەریک نەدەکرد بە شتێکەوە کە دوری بخاتەوە لە خوێندن و جومعە و جەماعەت و تەنانەت لە مەجالیسی زیکری خودا بەتایبەت لە مەدرەسەکانی نەقشبەندیدا، بەتایبەت ئەوسا کە ئەم ئامێری تەکنەلۆژیای چەواشەکارانەی سەردەم نەبوو کە دوو سەرن وەک (مۆبایل و ئینتەرنێت و تۆڕی کۆمەڵایەتی)، تا لەو کایانەدا کاتی زێڕینی زایە بکات و لە شتی بێ بەهادا مێشکی سەرقاڵ بکات، هەروەها خۆی سەرقاڵ نەدەکرد بە سیاسەتبازیی و حیزبایەتییەوە تا لە (ما لایعنی) دا کاتی بەسەر بەرێت و خوێندنەکەی بکات بە قوربانی کورسی دەسەڵاتی خەڵکێکی تر و ئەوانیش وەک پەیژە بەکاری بهێنن و پاشان هیچ حیسابیشی بۆ نەکەن، بەپێچەوانەی خوێندکاری ئەمڕۆی قەتابخانە و کۆلێژەکان کە لە بری خوێندن و ئامادەکردنی دەرس و موتاڵەعەی کتێب زۆربەی کاتەکانیان بە فیڕۆ دەدەن بە خەریک بوون بە مۆبایلەوە تەنانەت لە هۆڵەکانیشدا مەگەر ماموستایەک زۆر وریا و کارا و و زیرەک بێت ئەگەرنا گوێشی بۆ ناگرن، هەربۆیە ئەوەیان لێ دەر دەچێت کە کەس ئێرەییان پێ نابات وەک

عەرەب دەڵێت(لا يحسد عليهم) لە تەمەڵی و نەزانی و نابووتیدا، مەگەر دانە دانەیەکیان کە گوێڕایەڵ و عاقڵ و بە سەلیقەبن هەم خوێندنی فەقێیەتی بکەن و هەم خوێندنێکی باشی ئەکادیمیش ڕاپەڕێنن و خۆیان تەنها بە دەرس و دەورەوە خەریک بکەن. پەند وەربگرن لە حەزرەتی مەحوی کە لەگەڵ ئەو هەموو عیلم و مەعریفەت و عیرفانەی خۆیدا هەر ناڕازییە لە خۆی و سەرزنشتی خۆی دەکات و دەفەرموێت:

**بە زایع چوو لە ما لا یەعنیا وەقتم هەموو یەعنی**

**ئەبێ وەقتێ لە بولوەقتێ بخوازم، تا تیـیا بمـرم!!**

**جیاوازی هەشتەم: لەڕووی ئامادەباشی و تەحزیرکردنی وانەکان**

فەقێ لە قوتابخانەی سەر بە مزگەوت و خانەقاکاندا هەرگیز بەبێ موتاڵەعەی شەوانە بۆ وانەکی (خوێنراو و نەخوێنراو) سبەینێ نەدەهاتە خزمەت مامۆستاکەی بۆ خوێندنی وانەی نوێ، چونکە دەرسی پێ نەدەگوترا بەبێ لێپرسینەوە لە وانەی پێشتری، بەڵام قوتابی قوتابخانەکانی ئەکادیمی بە دەگمەن نەبێ تەحزیر و موتاڵەعەیان نییە، تەنها لاپەڕە هەڵدەدەنەوە و هیچی تر، بۆیە لەکۆتاییدا کە ئیمتیحان دەکرێن بەشێکیان هیچ نازانن بەشێکیشیان دەکەونە پاڕانەوە و واسیتەکردن، تەنانەت هەندێکیشیان پەنا بۆ قۆپی و غەش دەبەن.

**جیاوازی نۆیەم: لەڕووی کاتژمێرەکانەوە**

وەک پێشتریش ئاماژەمان پێدا خوێندنی وانە لە فەقێیەتیدا بەپێی کاتژمێر نەبوو، بەڵکو بەپێی تەواوبوونی وانەکە و تێگەیشتن و حاڵی بوونی تەواوی قوتابیەکە بوو لە تەواوی ئەو وانەیەی کە دەیخوێنێت، بەڵام لە خوێندنی ئەکادیمیدا ئەمە نییە، هەروەها کاتژمێرێکی زۆر بە فیڕۆ دەڕوات لە چەندین وانەی جۆراوجۆردا ،بەڵام بێ سود و بێ ئاکام، بەپێچەوانەی خوێندنی فەقێیەتی کە ڕۆژانە خوێندنێکی کەم و پوختە، بەڵام بە ئاکام و پڕبەرەکەت.

**جیاوازی دەیەم: لەڕووی شێوازی دەرسخوێندن و سەماعکردنەوە**

فەقێ ڕۆژانە تەنها یەک وانە یان دوو وانەی دەخوێند، پاشان ئەگەر تاقەت و توانای هەبوایە سەماعی دەرسی جگە لە خۆیشی(فەقێکانی تر) دەکرد، چ ئەو وانانەی پێشتر خوێندویەتی، چ ئەوانەیش کە هێشتا نەیگەشتووەتێ، هەتاوەکو پێش وەختە ئامادەباشییان بۆ بکات، بەڵام لە سیستەمی خوێندنی ئەکادیمیدا سەماع و کۆێگرتن نییە بۆ قۆناغی جگە لە خۆی، مەگەر بە دەگمەن. هەروەها لە یەک ڕۆژدا بە ئیجباریی و بە ڕەهایی و بە کۆمەڵ و ـ کە جاری وا هەیە هەشتا قوتابی لە یەک پۆلدان ـ بێ گوێدانە ئاستی قوتابیەکان چەندین وانەی لە یەکتر جیاوازیان پێ دەگوترێت ئەوانیش هیچ شەوقێکیان نابێت بۆ وەرگرتن تا لێی حاڵی بن، چونکە ئیجبارییە و هەم تێکەڵ و پێکەڵە و هەم کاتژمێرەکانیشی تەواو زۆرە، هەندێک لە کۆلێژەکان لە بەیانییەوە تا ئێوارە هەر دەوامە، ئەوەش ئاشکرایە

کاری دەروونی خراپی هەیە لەسەریان. بۆیە لە فەقێیەتیدا بۆ خۆشی و نەکتە ـ کە هەم حیکمەتیش بوو ـ دەیانگووت: (دەرسی بەیانیان مامۆستا دەزانێت چی بە قوتابییەکەی دەڵێت و قوتابیەکەشی بە چاکی حاڵی دەبێت، بەڵام کەوتە نیوەڕۆ مامۆستا ئەزانی چی دەڵێتەوە، بەڵام قوتابی حاڵی نابێت، خۆ ئەگەر دەرس کەوتە ئێواران نە مامۆستا دەزانێت چی ئەڵێتەوە و نە فەقێکەش حاڵی دەبێت )! بۆیە لە سیستەمی فەقێیەتیدا دەرسەکان پاش نوێژی بەیانی دەستی پێ دەکرد سەعاتێکی دەما بۆ نیوەڕۆ هەموو فەقێکان لە دەرس و دەور دەبوونەوە، بەڵام لە خوێندنی ئەکادیمیدا زۆرێک لە وانەکان یان دەکەونە پاش نێوەڕۆ، نیوەی جۆری خوێندنیش بۆ خۆی ئێواران و شەوانە!

**ئەگەر ژیانی فەقێ و مەلا لە کەلەپوور و کلتووری کوردەواری لاببرێت، هیچ شتێك نامێنێتەوە بەناوی کلتوور و کەلەپووری کوردەواری!**

**جیاوازی یازدەیەم: لەڕووی ڕێز و ڕیعایەتی ئەدەبەوە**

ڕێز و ئەدەبکردن لە مامۆستا لە خوێندنی فەقێیەتیدا نەک هەر واجب بوو، بەڵکو وەک فەرزی عەینیش تەماشا دەکرا، چونکە ئەدەب و ڕەوشت بەرزی لە پێش عیلم و زانستەوە حیسابی بۆ دەکرا، کە ئەوەیش پەیامی حەزرەتی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) وەک دەفەرموێت: « إنما بعثت لأتمم مكارم الأخلاق» (رواه البيهقى بإسناد صحيح فى السنن الكبرى(٢٨/٢١) برقم(٢٠٨١٩) عن أبى هريره (رضى الله عنه) وأخرجه أحمد فى مسنده برقم (٨٩٥٢) والبخارى فى الأدب المفرد برقم(٢٧٣).

چونکە کە ئەدەبیش هەبوو ئیتر خوێندن ئاکامی دەبێت، بەپێچەوانەشەوە هەرکات ئەدەب ڕیعایەت نەکرا لەلایەن قوتابییەوە بەرانبەر بە مامۆستاکەی ئەو جیلەی لێ دەردەچێت کە ئێستە بە بەرهەم هاتووە و هیچ عاقڵێک ئاواتی پێ ناخوازێت: (شەیتان بازاڕی، کەس بە کەس، بێ ڕەوشتی، نەفامی، پێنەگەشتوویی، تێنەگەشتوویی، مانەوە لە هەرزەکاریدا تا مردن).

**جیاوازی دوانزە: لەڕووی لە بەرکردنی وانەی ڕۆژانە و مەتنەکانی زانستەکانەوە**

فەقێ پێویست بوو لە سەری ڕۆژانە ئەو دەرسانەی کە دەیخوێند هەمووی لە بەر بکات، بۆ ڕۆژی پاشتر بەلەبەر بۆ مامۆستاکەی بلێتەوە و، ئامادەی پرسیاریش بێت، بەڵام ئەم پرۆسەیە زۆر بە دەگمەن هەستی پێ دەکرێت، تا بە تازەیی خوێندنی ئەکادیمی چاو لە خوێندنی فەقێیەتی دەکات لە ئەنجامدانی کویز (QUIZ) ی ڕۆژانە ئەویش تا مامۆستایەک ئەنجامی دەدات دەی تر بێ خەبرن. بەهۆی ئەوەی کە فەقێ ڕۆژانە وانەکانی خۆی لە بەر دەکرد کاتێک کە تەواو دەبوو چەندین مەتنی بە هێزی لە تێکڕای زانستە عەقڵیی و نەقڵییەکاندا لەبەر بوو، ئایا چ قوتابییەکی ئەکادیمی ئەمڕۆ تەنها مەتنێکی لەبەرە لە تێکڕای ئەو زانستانەی کە بە حیساب خوێندوویەتی؟

**جیاوازی سیازدە: لەڕووی نوسینەوەی مەتن و حەواشی سەرچاوەکانەوە**

فەقێی لە خوێندنی فەقێیەتیدا دەیان مەتن و حاشییەو تەعلیقاتی زانستی تێکڕای زانستەکان بەدەست و پەنجەی خۆی دەنوسییەوە کە پێی دەگوترا (دەسخەت) کە بەرهەم و دەرەنجامی زۆر بە هێز و گرنگی دەبەخشی لەوانە:

أ- شارەزابوونی تەواو لەو مەتن و سەرچاوانەی کە دەینوسینەوە، چونکە قوتابی تا زانستەکە بۆ خۆی نەنوسێتەوە باش لێی حاڵی نابێت.

ب ـ فێربوونی حاشیە و کونە قەید و تەعلیقات و نیکاتی زانستی.

ج ـ فێربوونی خەت و شێوازەکانی خەتخۆشی.

د- لەڕووی ئابووریشەوە کەڵکی هەبوو، چونکە لە بری ئەوەی کتێبەکە بکڕێت بۆ خۆی دەینوسییەوە.

هـ ـ نوسینەوەی ئەو دەستخەتانەی فەقێ و مەلا قەدیمەکان لە مێژوودا بوونە سەرمایەی گەورەی میللەتانی ئیسلامی لە دونیای شارستانیدا، بەتایبەت زانایانی کورد، کە ئەگەر دەسەڵاتدارانی ئێستای هەرێمی کوردستان دڵسۆز بوونایە لەم سێ دەیەی کە ڕابورد دەیانتوانی هەزاران دەستخەتی زانایانی کورد کۆبکەنەوە و لە فەوتان ڕزگاریان بکەن و گەورەترین مۆزەخانە و مەکتەبە و خانەی دەستخەتی کوردی(دار المخطوطات الكردية) دروست بکەن، شانبەشانی میللەتانی تری جیهانی ئیسلامی و غەیرە ئیسلامیش میللەتەکەمان پێ سەربەرز بێت، چونکە دانراو و دەستخەت هێمای شارستانیەتی هەر میللەتێکن، بەڵام بەداخەوە ئەوەی بیریان لای نەبێت زانست و سەرچاوەی زانست و کولتوور و کەلەپووری زانایانی کوردە لە سەدان ساڵەوە تا ئەمڕۆ، چەندین جاریش لە زۆر موناسەبەدا پێمان ڕاگەیاندوون.

## جیاوازی چواردە: لەڕووی پانتایی جوگرافیای دونیای زانستییەوە

ئەگەرچی ئەوسای ژیانی فەقێیەتی وەک ئێستا نەبوو، زانست پێشکەوتوو نەبوو لەڕووی تەکنەلۆژیا، ئینتەرنێت بوونی نەبوو، بەڵام لە هەندێ ڕووەوە قوتابی حوجرە بلیمەتر بوو لە قوتابی ئەکادیمی ئەمڕۆ، بەنموونە پانتایی جوگرافی زیاتر بوو لە پرۆسەی خوێندنیدا، دەچوو، دەهات، دەگەڕا بە تەواوی جێگا و مەدرەسەکاندا، لە ئێران بایە یان عێراق، لە میسر بایە یان حیجاز، لە یەمەن بایە یان خوراسان، لە هیند بایە یان سیند و ئەفغان، لە بوخارا و سەمەرقەند بایە یان قورتتوبە و ئیشبیلییە و غەرناتە، دەگەڕا وەک هەنگ لە گوڵی ناوازە و تام و بۆنخۆش بەرامی ڕەحیقی کۆدەکردەوە و نەدەوەسا تا دەینوسییەوە یان دەیگەیاند بە جیلی پاش خۆی، ماندوو نەدەبوو لە گەڕان بە دوای مەدرەسە و مامۆستای باشدا، بەنموونە بیانزانیانە مامۆستایەکی باش هەیە لە زانستی لۆجیک یان فەرائیز یان زمانەوانی یان بەلاغە یان تەفسیر وتەجوید و زانستەکانی قورئان و فەرموودە، یان جەبر و موقابەلە یان حیکمت و تەصەووف یان فلسەفە و عەقائید یان هەندەسە و ئوستورلاب و تەشریح و فەلەکناسی، یان شیعر و ئەدەب و عەرووز ..هتد دەچوون بۆ خزمەتی هەرچەندە دوریش بووایە و بشکەوتنایەتە مەترسییەوە، بەڵام خوێندکاری ئەمڕۆی ئەکادیمی کوا ئەو هیمەتە و ئەو پانتاییە جوگرافییەی خوێندنیان، لەگەڵ ئەم هەموو ئەسبابی ڕاحەت و هاتوچۆ و تەکنەلۆژیایەش کە لە بەردەستیاندایە؟!

جیاوازی پازدە: لەڕووی یەکڕیزی لە پەیڕەوی فیقهی و عەقائیدیی و عیرفانییەوە

قوتابی نێو تەواوی مەدرەسەکانی حوجرەی کوردستان یەک پەیڕەوی فیقهیان هەبووە و هەیە ئەویش پەیڕەوی پێشەوای زانایانی سەلەفی ساڵح ئیمامی شافیعییە (ر.خ)، هەروەها یەک پەیڕەوی عەقائیدییان هەبووە ئەویش پەیڕەوی پێشەوای ئەهلی سوننەت و جەماعەت ئیمام (أبو الحسن)ی ئەشعەرییە (ر.خ)، هەروەها لەڕووی سلووکەوە هەمووشیان موعتەقید و ئیرادەتمەندی ڕێبازی تەصەووف بوون، بەجیاوازی مەشرەبەکانی وەک: نەقشبەندی و قادری و ڕیفاعی و سوورەوەردی (ڕەزای خوایان لێ بێت)، بۆیە پیاوی بلیمەت و زانای هەڵکەوتوویان لێ دروست دەبوو، هەروەها هیچ خیلافێکی عەقائیدی یان دەمارگیرییەکی مەزهەبی یان نەبوو، بەڵام لە قوتابخانەکانی سەردەمی ئەکادیمی سەریان لێ تێکدراوە بە دروشمی بریقەدار، جیلێکی ناحاڵی بە (پەیڕەوی فیقهی و عەقائیدیی و تەصەووفییان) لێ دروستبووە ـ جگە لە کەمینەیەک نەبێت لە مامۆساتایانی متمانەداری زانا بەو حەقیقەتانە ـ بەناوی فیقهی موقارەنەوە قوتابی فێری لامەزهەبییەت و جورئەت لەسەر فەتوادان و تەرجیحی نێوان مەزاهیبی فوقەها بگرە بەڵگە شەرعییەکانیش دەکەن، بەناوی کیتاب و سوننەتەوە فێری عەقیدەی

تەشبیهو تەجسیم و خەواریجیان دەکەن، بەناوی بیدعەت وخورافاتەوە خەڵکی فریو دەدەن بەرەو بێ ئەدەبی بەرانبەر گەورە پیاوانی هەردوو زانستی فیقە و تەصەووف دەبەن، ئەوەش نەتیجەکەیەتی کە لە هەندێ مزگەوت و قوتابخانە و کۆلێژەکاندا بە ڕوونی هەستی پێ دەکرێت. بۆیە کاتێک میللەتی کورد یەک مەزهەب بوو لە فیقهو عەقیدەدا هیچ گرفتێکی وەک تەوژمی تونڕەویی و سەلەفیزم و بەرهەمی ئەوانیش کە داعشە لەنێو کوردان و لە کوردستان بوونی نەبوو.

**جیاوازی شازدە: لەڕووی جۆری بڕوانامە و سەنەدی بڕوانامەکە و لەخۆگرتنی ئامۆژگارییەوە**

لە فەقێیەتیدا پاش تەواوبوونی زانستە عەقڵی و نەقڵییەکان مامۆستای موجیز بڕوانامەی زانستی بە سەنەدی بەرزی گرێدراوی نەپچڕاو لە مامۆستاکەی خۆیەوە تا حەزرەتی پێغەمبەری نازدار (صلى الله عليه وسلم) دەبەخشێتە فەقێ موجازەکە بە مەراسیمێکی شایستە لەنێو مزگەوتدا و بە سروود و سڵاواتدانەوە، وەک بەرجەستەبوونی ئەو حەقیقەتەی کە ئەم ئوممەتی ئیسلامە ئوممەتی سەنەدە و نابێت کەسێک دەرس بڵێتەوە یان فەتوا بدات یان ئیمامەت بکات مەگەر بە سەنەد مۆڵەتی تایبەت و بڕوانامەی زانستی حوجرەی هەبێت، جگە لە تەقوا و وەرع و باقی مەرجەکانی تر کە لە کتێبە ئسوڵییەکاندا باسیان لێکراوە و ئێمەیش لە دانراومان: (المنهج العام للمجلس الأعلى للإفتاء في كوردستان ـ المبادئ، الضوابط، الأهداف، البنود، التعليمات) ئاماژەمان بە درێژی پێ داوە.

بۆیە فەقێی حوجرە ئەو بڕوانامەیە بە شایستەیی وەری دەگرت، بەپێچەوانەی بڕوانامەکانی دەرچووانی زۆربەی زۆری کۆلێژەکانی ئەمڕۆ کە بە ناشایستەیی پێیان دەدرێت و لە ساحەیەکی تێکەڵاو بە کچ و کوڕ و بە فیک و هووڕ بڕوانامەیان لە زانستە ئیسلامییەکان پێ دەدرێت کە پاش دەرچوونیشیان زۆربەیان نازانن تەنها لاپەڕەیەک عەرەبی بە درووستی بنووسن یان بیخوێننەوە، هیچ قیمەتێکی ئەو بڕوانامەشیان لەلا نییە مەگەر بە دەگمەن.

**جیاوازی حەڤدە: لەڕووی دەستبەکاربوونی قوتابی ڕاستەوخۆ پاش وەرگرتنی بڕوانامەکەی**

بەهۆی ئەوەی لە خوێندنی فەقێیەتیدا بەردەوام فەقێ هەم قوتابییە لای مامۆستاکەی خۆی هەم مامۆستایشە بەنیسبەت خوارووی خۆیەوە، واتە (مستعد) دەرس بە (سوختە) دەڵێتەوە و خۆیشی دەرس لای مامۆستای (مدرس) دەخوێنێت، کاتێک کە هەموو زانستەکان تەواو دەکات کارا و شایستە و بە قابیلییەتە بۆ گوتنەوەی تێکڕای ئەو زانستانەی کە خوێندوویەتی، چونکە زانستەکان بوونەتە مەلەکە بۆی، هەربۆیە ڕاستەوخۆ ئەویش پاش بڕوانامە لە حوجرەیەکی دیکە و لە ناوچەیەکی تر دەبێتەوە مامۆستا و مودەڕیس و درێژە بەو پرۆسە جوانە دەدات، بەڵام دەرچووی کۆلێژ سەرەتا شتێکی وای نەخوێندووە کە بتوانێت پاش دەرچوون ڕاستەوخۆ ببێتەوە مامۆستا، خۆ ئەگەر بوو

بە مامۆستاش ئەوکات مامۆستایەکی فاشیلی لێ دەردەچێت، چونکە زانستەکانی ڕەوان نەکردووە و نەیگوتووتەوە بە قۆناغی خوار خۆی لەکاتی خوێندنی خۆیدا، هەروەها نیوەی ڕۆژگاری خوێندنی غایب بووە و وەک خۆیان دەڵێن: (لێی داوە)، ئاخر خۆ ئەمە عەسکەری زۆرە ملێ نییە تا لێی بدات، بەڵکو عیلم و مەعریفەتە، لە چی ئەدات؟ بەو چەشنەش ئیتر چۆن بەراورد دەکرێت بە فەقێی نێو قوتابخانەکانی سەر بە مزگەوت و خانەقاکانی کوردستان؟ هەربۆیە لە حوجرەدا پیاوی وەک: مەولەوی و نالی و مەحوی و جەزیری و خەرپانی و بێسارانی و باڵەکی و ڕەنجوری و حەزرەتی مەولانا خالیدی نەقشبەندی و ئیبن قەرەداغی و نۆدشی و پێنجوێنی و نامی لێوە بەرهەم هات، بەڵام لە دەرچووانی ئەکادیمی مەگەر لە فەقێیەتیشدا خوێندبێتیان ئەگەرنا هیچیان لێ دەرناچێت کە بە کەڵکی خۆیان یان میللەتیان بێن.

**جیاوازی هەژدە: لەڕووی زەواجکردن**

لە فەقێیەتیدا بەدەگمەن فەقێ زەواج دەکات تا زانستەکانی تەواو نەکات و بڕوانامە وەرنەگرێت بیر لەو بابەتە ناکاتەوە، چونکە کورد واتەنی: (دوو کاڵەک بە دەستێک هەڵناگیرێت)، بەڵام لە کۆلێژەکاندا بەشێکیان زەواجی پێش وەختە دەکەن و بەشێکیشیان دڵیان لای زەواج یان خوانەکەردە نەزەری حەرام و پەیوەندی حەرامە(إلا من رحم ربی)، چونکە ژینگەی قوتابخانە و کۆلێژەکانیش بەداخەوە بۆ ئەو حەرام بازییە گونجاوە، بەپێچەوانەی ژینگەی مەدرەسەی حوجرەکان کە فەقێ بەردەوام لەنێو مزگەوت و خانەقادایە و غاڵبیش وایە کە موعتەکیفە و خەریکی دەرس و دەور و موتاڵەعە و قورئان و فەرموودە لە بەرکردنە.

**جیاوازی نۆزدە: لەڕووی گرنگیدان بە زانستەکانی عەقڵی و زمانەوانی شانبەشانی زانستە شەرعییەکان**

ئەمە سیمایەکی دیاری تری خوێندنی فەقێیایەتییە و جیاواز لە خوێندنی ئەکادیمی بەگشتی، چونکە لە خوێندنی ئەکادیمیدا کەمتر بایەخ دەدرێت بە زانستە عەقڵیی و بنچینەییەکان مەگەر تەنها بە ڕووکەش نەک بە ڕیشەیی و قوڵی، بۆیە قوتابی کە تەخەڕروج دەکات لە مەکتەب هیچ بناغەیەکی ئەوتۆی نابێت لە زانستە عەقڵیی و وێژەیی و زمانەوانی و بەلاغیدا، بێگومان کە بە نمونە (نحو صرف)یشی نەزانی ئیتر چۆن دەتوانێت ڕاڤەی قورئان و سوننەت بکات لەسەر مینبەر؟ یان کە زانستەکانی بەلاغەی نەزانی دەم و دەست دەکەوێتە جەهلێکی مەرەککەبی تەواو بە کیتاب و سوننەت و دەکەوێتە تەکفیرکردنی مسوڵمانان بە ڕاست و چەپدا و خوێنییان حەڵاڵ دەکات، ئەگەر بۆ خۆشی نەیکوشتن بەناوی جیهادەوە ئەوا خۆی دەتەقێنێتەوە بە مسوڵماناندا! چونکە فێر نەبووە لە خوێندنی حوجرەدا و نازانێت کە زمانی عەرەبی دوو جۆر ئوسلوبی سەرەکی

هەیە، یەکەمیان ئوسلوبی حەقیقی و دووەمیان شێوازی مەجازی  لە ئاخاوتن و دەق و قسەکردندا، کە لە دەقەکانی قورئان و سوننەتیشدا ڕەنگیانداوەتەوە، بۆیە زاهیری هەندێک ئایەت وەک خۆی ڕاڤە دەکات خۆشی کافر و گومڕا دەکات و مسوڵمانانیش بەو پێیەیش جیلی داعشیی بەرهەم دێت وەک لە ڕۆژگاری ئەمڕۆدا تاڵاوەکەی کەم تا زۆر هەموو جیهانی ئیسلامی چەشتی بەدەستیانەوە و لە سایەی ئەو نەفامانەیشدا کوفری جیهانی و زایۆنیزم و ماتریالیزمی جەدەلی و مولحید و ماسۆنییەکان حەساونەتەوە و مسوڵمانانیان بەو ئەکتەرە مێش زاخاودراوانەیان داوەتە بەگژی یەکتردا!

**جیاوازی بیست: لەڕووی وەرگرتنی فرە ئەزموونی لە مامۆستایانی ناوچە جیاوازەکانی کوردستانەوە**

وەک پێشتریش ئاماژەمان پێ دا، لەبەرئەوەی فەقێی حوجرەکان بەشێکی زۆریان بەردەوام دەگەڕان بەدوای مامۆستای باش و شارەزا و متمانەداردا، بەوهۆیەوە جۆرەها شێوازی وانەگوتنەوە فێردەبوون لە دەیان مامۆستای ناوچە جیاجیاکانی کوردستان، جگەلەوەش عورف و عادەت و دیالێکت و لەهجەی جیاواز فێردەبوون لە ناوچەکانی کوردستاندا. ئەم هەلە هەرگیز بۆ خوێندنی ئەکادیمی پەیدا نابێت، بۆیە پاش وەرگرتنی بڕوانامەکەشی تەنانەی زمانی کوردیش بەتەواوەتی و بە دیالێکتە جیاوازەکانی نازانێت، تەنانەت ئەگەر دەرچووی بەشی کوردیش بێت، چ جای زمانەکانی تری وەک عەرەبی و فارسی. بەڵام مەلای کورد بە لای کەمەوە هەر سێ زمان و ئەدەبیاتی کوردی و عەرەبی و فارسی ئەوکات کە باو بووە دەیزانی و دەیتوانی قسەی پێ بکات و شیعریشی تەنانەت پێ گوتوون، هۆکارەکەشی جگە لە پرۆگرامەکانی خوێندن ئەوە بوو کە باسمانکرد لە وەرگرتنی فرە ئەزمونی و ئاشنابوونی بە دیالێکتە جیاوازەکانی کوردستان بەهۆی گەڕانیەوە بۆ وەدەستهێنانی زانست و مەعریفەت و ئەزموونی شایستە.

**جیاوازی بیست و یەك: لەڕووی گرنگیدان بە زانستی حیکمەت و پەندیاریی و ئەدەب و شیعر و پەخشانەوە**

تاڕادەیەک ئەم خاڵە نزیکە لە خاڵی سەرەوە لەڕووی میکانیزمەوە، جگەلەوەی کە ئەدەبیاتی زمانەکانی (کوردی، عەرەبی، فارسی) لە خودی مەنهەج و پرۆگرامەکاندا گرنگی پێ دەدرا لە خوێندنی فەقێیەتیدا، بەنموونە هەر لە سەرەتاوە فەقێ فێری نامەکانی (ئەحمەدی و دورشتە) دەکرا بۆ فێربوونی وشەی ڕەسەنی عەرەبی، هەروەها فێری (گولستان و بۆستان و ئەیشودە) دەکرا بۆ زانینی حیکمەت و ڕەوشتی بەرز و ئەدەبی فارسی، جگە لەو کۆمەڵە زۆرەی شەواهیدی شیعری عەرەبی و فارسی کە لەنێو کتێبەکاندا فێری دەبوو، شەوانی سێشەممانیش عادەتێکی جوان و نایاب هەبوو لە ژیانی فەقێیەتدا پێ دەگوترا (شەڕە شیعر): فەقێکان لەنێو خۆیاندا لەگەڵ فەقێ میوانەکانی حوجرەیەکی تردا دەبوون

بەدوو بە شەوە، دەستیان دەکرد بە شەڕە شیعر، بەم شێوەیە کۆمەڵی یەکەم شیعرێکی دەگووت، پاشان ئەو شیعرەی ئەوان بە چ پیتێک کۆتایی بهاتایە پێویست بوو کۆمەڵی دووەم بە هەمان ئەو  پیتە شیعرێکیان بگوتابایە، عەرەبی بێت یان کوردی یان فارسی یان تورکی گرنگ نەبوو بەڵکو گرنگ ئەوەبوو: (موافقة بداية صدر شعر الفريق الثاني للحرف الأخير لعجز بيت الفريق الأول)، هەتا لایەنێک شیعری لێ دەبڕاو دەدۆڕا، کە ئەوسا پێیان دەگوت (بۆڕ دەبوون)، ئیتر بۆئەوەی جارێکی تر بۆڕ نەبن، بەردەوام لە لەبەرکردنی شیعر و حیکمەت و دەقدا بوون، هەروەها هەمان پێشبڕکێش بۆ فەرموودەکانی پێغەمبەر (د.خ) دەکرا، ئێمە بۆ خۆمان زۆرجار ئەمەشمان دەکرد لە حوجرەی مەدرەسەی عومەری کوڕی خەتتاب (ر.خ) لە گەڕەکی ئیسکان لە سلێمانی کە فەقێ بووین، بەوهۆیانەیشەوە فەقێ کوردواتەنی: چاوی ماری دەردەهێنا و زۆر بلیمەتی لێ دەردچوو، ئەدەبیاتی چەندین زمان بەو ئاڵوگۆڕکردنە ئەگەر بەردەوام بووایە فێر دەبوو، بەوهۆیەشەوە سەقافەتێکی یەکجار فراوانی دەبوو، تا ئەندازەیەک کە بۆ خۆشی هەوڵی دانانی شیعری غەزەل و مەدیح و قەسیدە دەدا، بلیمەتانی جیهانی شیعر و هۆنراوەی کوردیش لە نمونەی (مەولەوی و نالی و مەحوی و ..هتد) بەرهەمی ئەو حوجرانە بوون بەو چەشنە، بڕواش ناکەم کەس بتوانێت تانە لەو ڕاستییانە بدات، بەڵام ئایا ئەم چەشنە ڕۆشنبیرییە فراوانە لە دەرچووانی قوتابیانی کۆلێژەکانی ئەمڕۆدا بوونیان هەیە یان پەیدا دەبن؟ نەک دەرچووی کۆلێژ جاری واش هەیە بەداخەوە چونکە تەنانەت دەرچووەکەی خوێندنی باڵاش شەهادەی ماستەر و دکتۆراکەی بە تەزویر یان ڕەشوە و گەندەڵی لەم وڵات و ئەو وڵات بەدەستهێناوە ئەگەر ڕۆشنبیرییەکەی بگوشیت مجەورێکی عاقڵی لێ پەیدا نابێت؟!

**جیاوازی بیست و دوو: لەڕووی کۆمەڵایەتی و سەردانی یەکترەوە**

سێشەممان و جومعان کە دەرس نەبوو لە حوجرەدا، فەقێکان یان میوانیان دەهات یاخود دەبوونە میوانی فەقێی حوجرەیەکی تر، هەم تەرفیهو تەنفیس بوو بۆیان، هەم ئاستی کۆمەڵایەتی و سەردان و ڕۆشنبیریشیان زیاتر و زیاتر دەبوو، وەک لە برگەی پێشوتر دا باسمان کرد. ئەم سەردانە ڕۆشنبیرییە کۆمەڵایەتییە پڕ ئەزموونانە زۆر بەدەگمەن لە خوێندنی ئەکادیمیدا بەرچاو دەکەون، هەربۆیە نەبوونیان کاریگەری نەرێنی هەبووە لەسەر قوتابیەکانیان بەپێچەوانەی فەقێیەتییەوە.

**جیاوازیی بیست و سێ: لەڕووی پارێزگاری لە دابونەریتی جوانی کوردەوارییەوە**

ژیانی فەقێیەتی چونکە هەڵقوڵاوی ژیانی کوردەواری بوو، زانست و مەعریفەت و عیرفانی هاوردەی وڵاتان و کاری موخابەراتی ئەملاو لا نەبوو، بۆیە گەورەترین کاریگەری ئەرێنی هەبوو لەسەر مانەوەی دابونەریتی جوان و حیکمەت و شیعر و نوکتە

و حیکایەت و کلتوور و کەلەپووری کوردەواری تەنانەت جلوبەرگ و وەرزش و هۆنەر و دەنگخۆشی و هەتا دەگاتە جۆرەکانی هەڵپەڕکێی کوردەواریش کە لە ئاهەنگی بڕوانامەی فەقێیەتیدا گرنگی زۆری پێ ئەدرا، واتە ئەگەر ژیانی فەقێ و مەلا لە کەلەپوور و کلتووری کوردەواری لاببرێت، هیچ شتێک نامێنێتەوە بەناوی کلتوور و کەلەپووری کوردەواری!

بەڵام کوا جێ پەنجەی قوتابیانی ئەکادیمی و سیستەمی ئەکادیمی ئەمڕۆ تەنانەت لەو بوارانەیشدا، وەک ڕوونە جلوبەرگیشیان بووەتە چاولێکردنی وڵاتانی بێگانە و هەندێک لە کاربەدەستان عەییان لێ دێت تەعلیماتێک دەربکەن سەبارەت بە پێویستی پۆشاکی کوردی لەنێو قوتابخانە و کۆلێژەکاندا، هەربۆیە بەڕاستی بوونەتە هۆی پاشەکەشەی میللەتی کورد لەو بوارانەشدا.

**جیاوازی بیست و چوار: لەڕووی لێپرسینەوەی قوتابیان**

بەردەوام مامۆستا لێپرسینەوەی ئەنجام دەدا و ئاگاداری قوتابیانی نێو حوجرەکەی خۆی دەبوو، خانەوادەکانیشیان سەردانی بەردەوامی حوجرەکانیان دەکرد بەمەبەستی ئاگاداری لە ڕەوشی خوێندن و ڕەوشتی منداڵەکانیان، ئەمەش هۆکار بووە بۆ دامەزراوی فەقێ لەڕووی ڕەوشت بەرزیی و مەعریفەتەوە، هەروەک چۆن دامەزرا و بووە لەڕووی زانست و خوێندنەکەیەوە، بەڵام ئەم جۆرە لێپرسینەوە لە ژیانی ئەکادیمیدا نەک نییە، بەڵکو لە پرۆگرامی خوێندنیاندا زۆرجار و لە زۆر قۆناغدا بەردەوام برەو بە بیری نامۆ، فەلسەفەی پووچ، نەریتی سەقەتی بێگانە، غەربی و ئەورووپی بەتایبەت، لەپێناو لەخشتەبردنی تاکەکان و بەوهۆیەشەوە خێزان و کۆمەڵگە بەرەو ئینحیراف لادان و لێکترازان و نا موسڵمانی بڕوات، هەروەک چۆن لەم سەردەمەدا هەوڵی جیددی دەدرێت لە هەندێک زانکۆ و قوتابخانەکاندا بۆ چاندنی فەلسەفەی جێندەر و بەدرەوشتی و تێکەڵخوازیی و ڕەگەزبازی و ...هتد، کە پێویستە بە هەموو لایەک ڕێگری لێ بکرێت بەپێی فەرموودەی درووستی : **«ألا فكلُّكم راعٍ وكلُّكم مسؤولٌ عن رعيَّتهِ» (متفق عليه من ابن عمر (رضي الله عنهما) ينظر: صحيح البخاري (٧/ ٣٤)برقم(٥١٨٨)، صحيح مسلم(١٤٥٩/٣) برقم(١٨٢٩)، ورواه الطبراني في المعجم الأوسط (٤٧/٤)برقم(٣٥٧٦) من حديث أنس بن مالك (رضي الله عنه) وفي رواية أخرى في مستخرج أبي عوانة (٤/ ٣٨٤) برقم(٧٠٣٦ ) عن أنس (رضي الله عنه) مرفوعا: «إِنَّ اللَّهَ سَائِلٌ كُلَّ رَاعٍ عَمَّا اسْتَرْعَاهُ، حَفِظَ ذَلِكَ أَمْ ضَيَّعَ، حَتَّى يَسْأَلَ الرَّجُلَ عَنْ أَهْلِ بَيْتِهِ».** واتە: خودای گەورە دەپرسێتەوە لە دەسەڵاتدار بەرانبەر بە ڕەعیەت و ژێردەستەکانی، کە ئایا ئاگاداریان بووە یان زایەی کردوون و بەوهۆیەشەوە فەوتاون خۆیان یان ئیمان و ئیسلام و ئیحسانەکەیان، تەنانەت دەشپرسێتەوە لە پیاو (گەورەی خێزان)، چونکە بەرپرسە لە بەرانبەر ماڵ و منداڵەکەی

خۆی»، بەڕاستی ئەگەر ئەم حاڵەتانەی کە ئێستا هەیە و دەگوزەرێ و تەرویجی پێ دەدرێت و وۆرکشۆپ و سیمپۆزیۆم و کۆنفرانسی بۆ دەبەسترێت لێرە و لەوێ ئەگەر چارەسەر نەکرێت، دەبێتە دیاردە و، پاشان دەبێتە نەریت و عادەت، ئیتر هیچ بەهایەک نامێنێتەوە بۆ ئایین و بیروباوەڕ، تاک و خێزان و کۆمەڵگەی ڕەفتار جوانی کوردەواریش بەرەو هەڵدێر دەڕوات و تاکەکانی وردە وردە دەبنە خۆراکی کوفری جیهانی.

**جیاوازی بیست و پێنج: لەڕووی پاراستنی ئەمانەتی زانستی**

جیاوازییەکی گەورە هەیە لەڕووی پاراستنی ئەمانەتی زانستی و وەفاداری لە نێوان فەقێی نێو حوجرەکان و زۆرێک لە قوتابی نێو قوتابخانەی ئەکادیمیدا، بەشێوەیەکی گشتی، چونکە بەنمونە: فەقێ پابەندە بە پارێزگاری کردن لەو کتێبەی کە دەیخوێنێت، بەرگی تێ دەگرێت و جزوبەند (تجلید)ی دەکات، وەک چاوی دەیپارێزێت، بەڵام خوێندکاری قوتابخانە بەشێوەیەکی گشتی هیچ ڕێزێک ناگرن لەو سەرچاوانەی کە وەری دەگرن و قیمەتی نازانن، بەڵکو لەژێر خۆیان دایدەنێن و کاتێکیش کە تەواو دەبن لە ئەزموونەکانیان زۆربەیان فڕێی دەدەن و دەیدڕێنن، ئەگەر بچێتە هەر قوتابخانەیەکی ئەکادیمی لە ڕۆژانی تاقیکردنەوەکاندا بەتایبەت ئەو دیاردەیە بەڕوونی دەبینیت. هەروەها ئەو ئەمانەتەی کە لەسەرشانیانە کەم وەها ڕێدەکەوێت قوتابی قوتابخانە بە کۆلیژیشەوە پابەند بن بە بڵاوکردنەوەی بە ئەمانەتەوە بە جیلی داهاتوو، بەپێچەوانەی فەقێکانەوە کە پاش تەواوبوونیان لە هەوڵی خزمەتکردندان بە میللەتەکەیان بەبێ بەرانبەر و بە خۆبەخشی و لەپێناو خودادا (جل جلالە).

**جیاوازی بیست و شەش: لەڕووی وەفادارییەوە**

لەڕووی وەفارداریشەوە بۆ مامۆستا و خێزان و هاوڕێ و خەڵکییەوە بەگشتی سەیر دەکەیت بەنموونە: فەقێ چەند وەفادارە بۆ مامۆستاکانی تەنانەت پاش مردنیشیان بێ بەشیان ناکات لە نزا و سەدەقە و فاتیحا بۆ ناردنیان و سەردانی گۆڕەکانیشیان تەرک ناکەن تا بتوانن، هەروەها وەفادارە بۆ خێزانەکەی خۆی، کەم ڕێ دەکەوێت بەجێیان بهێڵێت و ڕێگەی هەندەران بگرێتە بەر، هەروەها وەفاداریشە بۆ هاو فەقێکەی و بەردەوام لێی دەپرسێتەوە و سەردانی یەکتر دەکەن، هەروەها وەفاداریشە بۆ میللەت و خاک و نیشتیمانەکەی، بەنموونە: شۆڕشەکانی کورد لە مێژوودا بەردەوام فەقێ و مەلا و شێخ سەرمەشق بوون تیایاندا کە پێگەیشتوو و تێگەیشتووی حوجرەکان بوون. بەڵام ئایا چەند ئەم ئەمانەت و وەفادارییە ئەمڕۆ بەدی دەکرێت لەنێو پرۆسەی خوێندی ئەکادیمیدا؟ وەڵامەکی لای خوێنەری بەڕێزە و چاک دەزانێت ئەمانەت و ئەدەب و وەفاداری چۆن ماڵئاوایی کردووە لەنێو زۆربەیاندا مەگەر بە دەگمەن بەدی بکرێت!

**جیاوازی بیست و شەش: لەڕووی کەوتن و ڕاسب بوون و تەمەنەوە**

کەوتن و ڕاسب بوون زۆر دەگمەنە لە پرۆسەی خوێندنی فەقێدا، چونکە هەم مامۆستاکە و هەم قوتابیەکە ئەوەندە خۆشەویستی زانست دەچێتە دڵیانەوە و ماندووبوون نازانن چییە، ئەگەر فەقێکە دەجار پێویست بوو وانەکەی بۆ دووبارە بکرێتەوە ئەوا مامۆستاکەی لەبەر خوا بۆی دووبارە دەکاتەوە تا تێدەگات و لەبەری دەکات، ئیتر وردە وردە پێدەگات و واز لە خوێندن ناهێنێت و کۆڵنادات و فرسەتی خوێندنی هەر دەمێنێت، لە چ تەمەنێکیشدا بێت هەر دەتوانێت بەردەوام بێت و دەست پێ بکات، بەڵام لە خوێندنی ئەکادیمیدا هیچ لەمانە ڕیعایەت نەکراوە، وەک ئاشکرایە ساڵی کەوتن هەیە و تەرقین قەید هەیە و تەمەنیش مەرجە بۆ خوێندنی بەیانیان و بۆ خوێندنی باڵاش.

**جیاوازی بیست و حەوت: لەڕووی پشووەکانەوە**

لە فەقێیەتیدا دوو جۆر پشوو هەیە:

جۆری یەکەم: هەفتانەیە کە ڕۆژانی سێشەممە و هەینییەکانە، سێشەممان بۆ ئیشوکاری قوتابی وەک شۆردنی جلوبەرگی خۆی یان سەردانی حوجرەی تر بە ڕەزامەندی مامۆستاکەی، یان سەردانی بازاڕ و دائیرەیەک بۆ کاری گرنگ، هەینیش بۆ عیبادەت و زیکر و فیکر و ئەگەر (مستعد)یش بوو دەچێتە گوندێک بۆ گوتاری ڕۆژی هەینی.

جۆری دووەم: مانگی ڕەمەزانانە لەگەڵ جەژنەکەیدا، ئەویش تەرخان دەکرێت لەلایەن فەقێوە بۆ (مەلا ڕەمەزانی) واتە فەقێکە بە فرسەتی دەزانێت لە ڕەمەزاناندا بچێتە گوندێک فرسەتی نەبوونی دەرس و دەور بقۆزێتەوە بۆ ئامۆژگاری ئەهلی ئەو گوندە و تەراویح و نوێژی هەینی و جەژنەکەیشیان بۆ بکات پاشان بگەڕێتەوە بۆ حوجرەکەی. ئیتر تەواوی ڕۆژانی ساڵ بە بەردەوامی و بێ پچڕاندن، زستان و هاوین فەقێ خەریکی دەرس و دەوری خۆیەتی. ئەگەر ورد ببینەوە لە هەردوو جۆرە پشووەکەیان دەبینین زۆر پڕ حیکمەتە و وەرگرتنی ئەزموونی زانستی و مەعریفەتە و بۆ زۆر شتی پێویستە و پەیوەستیشن بە خودی پرۆسەی خوێندنەوە، هەینییەکان و ڕەمەزانان ناکرێت خوێندن بەردەوام بێت لەبەر واجبی گرنگتر، سێشەممانیش تەنفیسە و پێویستە قوتابی ڕۆژێکی هەبێت بۆ خۆیی و کاروباری.

بەڵام لە پشووی ئەکادیمیدا هەفتانە ڕۆژی هەینییان هەیە، بەڵام ئیلزام ناکرێن بە پابەند بوون بە ئادابی ڕۆژی هەینییەوە بەڵکو غالب وایە کاتەکەیان لە سەفەری بێ بەها و سەیران و گەشتی ئاڵۆز و زۆرجاریش بێ شەرعی تێدەکەوێت وەک فەوتانی نوێژی جومعە، سێشەممانیشیان نییە کە پێویست بوو لە نێوان ئەو شەو و ڕۆژەدا ڕۆژێکیان لە ناوەندا هەبێت بۆ تەنفیس و هەوای باڵ، بۆئەوەی قوتابی بێزار نەبێت، هەروەها پێویست بوو مانگی پیرۆزی ڕەمەزان پشووبن بۆ ئەنجامدانی ڕۆژووەکانیان و ماندوو نەکرێن بە

خوێندنەوە، چونكە لەبەر ڕۆژ خوێندنیان باش پێیان ناكرێت، لەبەر خوێندنیش پابەندی تەواویان نابێت بە ئاداب و واجیباتی مانگی پیرۆزی ڕەمەزانەوە، ئەوكات لە مەلانیش دەبن و لە قەلانیش، كەچی دوو جۆری تر پشوویان پێ دەدرێت كە هیچ قازانجێك نابەخشێت بە قوتابی جگە لە پشتساردبوونەوەی لە خوێندن، وەك پێشەوامان حەزرەتی شافیعی دەفەرموێت: (فإن رسوب العلم في نفراته) واتە: « لەڕاستیدا فەوتانی زانست لە پچڕ پچڕیدایەتی» واتە ماوەیەك بخوێنێت و ماوەیەك وازی لێ بهێنێت، وەك لە چامەكەیدا لە (دیوانەكەیدا، ل٥٨)دەفەرموێت:

**إصبِر عَلى مُرِّ الجَفا مِن مُعَلِّمٍ * فَإِنَّ رُسـوبَ العِلـمِ في نَفَراتِـهِ**

**وَمَن لَم يَذُق مُرَّ التَعَلُّمِ سـاعَةً * تَذَرَّعَ ذُلَّ الجَهـلِ طولَ حَياتِـهِ**

**وَمَن فاتَهُ التَعلُّمُ وَقتَ شَبابِــهِ * فَكَبِّـر عَلَيـهِ أَربَعـاً، لِوَفاتِهِ**

**وَذاتُ الفَتى وَاللَهِ بِالعِلمِ وَالتُقى * إِذا لَم يَكونا لا اِعتِبارَ لِذاتِهِ**

ئەمە جگە لەوەی كە دەیان ڕۆژی پچڕ پچڕی تر لە قوتابخانەكانی ئەكادیمیدا دەكرێتە پشووی فەرمی بێ ئەوەی هیچ پەیوەندی بە قوتابی یان مامۆستاوە هەبێت، هەمووی هەر لێدانە، بەڵام لێدان لەسەر حیسابی زانست و مەعریفەت، كەواتە جیاوازی زۆر هەبوو لە نێوان ئەم دوو جۆرە پشووەدا، پشوویەك قوتابی پێگەیێنێت، كە پشووی فەقێیەتییە، و پشوویەكیش سەر لە قوتابی تێ بدات كە هی ئەكادیمییە.

**جیاوازی بیست و هەشت: لەڕووی بەكارهێنانی زانست بۆ بازرگانی**

هەرگیز نەبیسراوە مامۆستای حوجرە ئیستیغلالی فەقێ و حوجرەكەی خۆی بكات و بە پارە و بۆ دونیا دەرسیان پێ بڵێت، بگرە لە گیرفانی خۆیان و لە ماڵی خۆیانەوە زۆرجار نان دەڕۆیشت دوو ژەمە بۆ فەقێكان، (بەنموونە) ئەو پرۆسەیەم بە درێژایی دەیان ساڵ لە ماڵی خۆماندا بەدی كردووە و ڕەنگە تەواوی ئەو فەقێیانەش كە دەیانخوێند لە خزمەتی جەنابی باوكمدا، واتە لە خزمەت مەرحومی (مامۆستا شێخ خالیدی موفتی)دا بەتایبەت لە مەدرەسە سەرەكییەكەی خۆی لە مزگەوتی گەورەی هەڵەبجە ئەو شەهادەتە بدەن و ئاگاداری ئەو ڕاستییە بن، بەڵام وەك ئاشكرایە زۆربەی پەیوەندی نێوان قوتابی ئەكادیمی و مامۆستا و حكومەت پەیوەندییەكی ماددیە و لەسەر بنچینەی بازرگانی و مووچە و پارەی محازەرات پێكهاتووە و دەڕوات، بەتایبەت لەم دواییانەدا كە خوێندنی (پاراڵێل) (Parallel)یشی هاتە سەر! هەروەها پاشەكشەی كوالێتی(quality) خوێندنی حكومی ئەوەندە بەرچاو و داماوە، خەڵكی مەجبوورن (بەخودی زۆرێك لە مامۆستاكانیشەوە) منداڵەكانیان بەرەو قوتابخانە ناحكومییە بازرگانییەكان ببەن و ئەوانیش(إلا ما رحم ربی) بە ئارەزووی تەماحی خۆیان ڕووتیان بكەنەوە!

**لە کۆتاییدا:** ئەمەی کە ڕابورد هەندێک بوو لەو جیاوازییە جەوهەرییانەی بوونیان هەیە لە نێوان خوێندنی زێرینی حوجرە و خوێندنی ئەکادیمی ئەمڕۆدا، کە بەپێی ئیستیقرا و بەدواداچوون بەندە ویستم لێرەدا بیانخەمە بەرچاو کە خۆی لە (بیست و هەشت جیاوازی) گرنگدا دەبینێتەوە، باسم کردوون نەک بەمەبەستی کەم سەیرکردنی خوێندنی ئەکادیمی و لەبەرچاونەگرتنی هەندێک لە ئیجابیاتی، بەڵکو بەمەبەستی ئاشناکردنی ئەم جیلەی ئێستا بەو جیاوازییە گەورانە و گەڕانەوەی بەها پیرۆزەکانی خوێندن و پەیوەندی قوتابی لەگەڵ مامۆستایدا و ئیخلاس لە خوێندندا، هەروەها بەمەبەستی چاولێکردنی خوێندنی ئەکادیمی لەو هەموو خاڵە ئیجابیاتانەی خوێندنی نێو حوجرەکانی سەردەمی زێڕینی گەلی کوردی موسڵمان.

**بۆیە دەڵێم:** سەردەمی زێڕینی حوجرە، چونکە بەداخەوە هەندێ حوجرەی سەردەمیش ناوەڕۆک و بەهای خۆی لەدەستداوە و هەندێک مامۆستاش دەبینین و دەبیستین ئیجازە نامەی زانستی مەلایەتی دەدەن بە فەقێ لەکاتێکدا بۆ خۆیان پێویستە هێشتا بخوێنن، کە بەهۆکاری جیاواز ئەو لادانە دروست بووە، لەوانەش سیاسەتبازیی و کادیر دروستکردنی حیزبی نەک پێگەیاندنی مەلای چاک و زانای بلیمەت، هەروەها خۆدەرخستن و کەمبوونەوەی تەقوا و زۆربوونی حوببی شوهرەت و ڕیابازی لەنێو بەشێکی بەرچاو لە حوجرەکانی ئەم سەردەمەدا، هەروەها بوونی بیری نادروستی نامۆ بە مەزهەبی میللەتی کورد لە هەردوو ڕووی فیقهی و عەقائیدییەوە کە بەو هۆکارە سەرەکییانەوە جیلێکی نا مەعقولی نا کامڵی نا مۆفەقی نا زانای نا دانای توندڕەوی بێ مەعریفەت خەریکە پەیدا دەبێت و هەندێک لە میحرابی مزگەوتەکانیشیان پێ تاریک بووە و وەزارەتی ئەوقافیش خۆی بێدەنگ کردووە و تەنانەت تا ئەم سات و کاتە هیچ ئیجرائاتێکی نەکردووە بەرانبەر ئەو سەدان خۆبەخشەی کە دەرنەچوون لە ئەزموونەکانی ئەنجومەنی زانستی وەزارەتدا!

بەوهیوایەی کە ئەم بابەتە مەترسیدارە چاکسازی ڕیشەیی تێدا بکرێت و گەندەڵی لە چینی پیرۆزی سەربەرزی مەلا و فەقێشدا نەکرێت. خوای گەورە یارمەتیدەری دڵسۆزانە.



نووسینی:  پرۆفیسۆر د. سەباح بەرزنجی

# ئاڵنگارییەکانی بەردەم خوێندنی ئایینی

تێبینی: ئەم نووسینە ڕۆژی ٢٠١٨/١٢/١٩ وەک سمینارێک لە زانکۆی کۆیە، لە دیدارێکی هاوبەشی زانکۆی کۆیە و سەنتەری زەهاوی بۆ لێکۆڵینەوەی فیکریی پێشکەشکرا.



نامەوێ لێرەدا پێناسەی خوێندنی ئایینی بکەم، چونکە پێناسەی زۆر و جۆراوجۆر هەڵدەگرێ، تەنها ئەوەندە دەڵێم بریتییە لە خوێندنی زانستە شەرعییەکانی قورئان و سوننەت و فیقهو ئصوول و بیروباوەڕ و عەقیدە و هەرچی پەیوەستە بەوانەوە لە زانستەکانی زمان و ویژە و مێژوو، هەروەها ئەوەی کە تاکی مسوڵمانی لەسەر پەروردە دەکرێ لە مزگەوت و حوجرە و قوتابخانە ئاینییەکان و کۆلێژ و پەیمانگاکان، یاخود لە ڕێی کەناڵەکانی تیڤی و سۆشیال میدیا و گۆڤار و ڕۆژنامەکانەوە سەبارەت بە ئایین و ئیسلامەتی باس دەکرێ بەمەبەستی ناساندن و پەروەردە و بارهێنانی خەڵک. لەم دەروازەوە دەتوانین بڵێین خوێندنی ئاینی لە هەموو جیهاندا و لە هەموو کۆمەڵێکدا بە ئاست و ئاسۆی جیاواز و فرەچەشن بوونی هەیە و بە ئامانج و مەبەستی جۆراوجۆر و ڕێکار و شێوازی هەمەجۆر پەیڕەو دەکرێ. خەڵکان و پسپۆڕانی زۆر لەم بوارەدا کار دەکەن و تێدەکۆشن بۆ ناساندن و شرۆڤە و پاراستن و پەرەپێدانی بە بەکارهێنانی پسپۆڕییەکانی دیکەی وەکوو دەروونناسی، کۆمەڵناسی، پەروەردە، سیاسەت، فەلسەفە، ئەدەبیات، مرۆڤناسی و مێژوو.

هەموو ئەم زانستانە ئاماژە دەکەن بۆ گرنگیی و هەستیاریی خوێندنی ئایینی، لەم ڕووەوە هەزاران کتێب و توێژینەوە و باس و وتار نووسراون، تا ئەو ئەندازەیەی کە هەنووکە ئایینناسی شلۆقترین بابەتی دنیای ئەمڕۆیە، چونکە مەحاڵە مرۆڤ وەک خۆی بناسرێ بەبێ تێگەیشتن لە بیر و بڕوا ئاینییەکانیی و بەبێ چوونە ناو قووڵایی بیر و هزری ئایینی و دەق و ڕاز و نهێنی سرووتەکانی.

قسەکردن لە دین باسکردنە لە بابەتێکی مەعریفیی دێرین و بێ کۆتایی لە هزری مرۆییدا هەر لە سەرەتای فامکردنەوەی مرۆڤەوە هەتاکوو ئەمڕۆ جگەلەوەی دینداریی مافێکی دەستەبەر و بێ چوون و چرای هەر مرۆڤێکە بەپێی هەموو شەریعەتە ئاسمانیی و یاسا زەمینییەکان، بۆیە هەر مرۆڤێک بۆی هەیە سەبارەت بەم مافە زانیاریی پێویستی هەبێ، لەهەمانکاتدا هەموو دیندارێک مافی خۆیەتی زانستەکانی پەیوەست بەو ئایینەی بخوێن ، چ بەشێوەی کلاسیک بێ یان بەشێوازی نوێ.

ئەگەر بمانەوێ بەراوردێک بکەین، واقیعی خوێندنی ئایینی لە کوردستان جیاوازیی ئەوتۆی نییە لە واقیعی ئەم خوێندنە لە وڵاتانی دەوروبەر، چ لەڕووی ناوەرۆک و سوود و ئامانج و دەرهاویشتەوە، چ لەڕووی ئاست و ئالنگارییەکانییەوە.

لە کوردستان دوو جۆر گرنگیدان بە خوێندنی ئاینیی هەیە، یەکێک لە چوارچێوەی دەزگای تەقلیدیی مزگەوت و مامۆستایانی ئاینیی، ئەویتر لە چوارچێوەی خوێندنی ئەکادیمیی فەرمیی وەزارەتەکانی پەروەردە و ئەوقاف و خوێندنی باڵا. لەبەرئەوەی ئایینی

ئیسلام و ئاینەکانی تری کوردستان هەتاکوو ئێستاش بەشێکی دانەبڕاون لە شوناسی پێکهاتەکانی کوردستان و ناکرێ و ڕێی تێناچێ خوێندنی ئاینیی نادیدە بگیرێت، هەرچەندە دەستگەلێکی گومانلێکراو هەوڵی بەردەوام دەدەن کە ئەم شوناس و حزوورە ئاینییە کەم بایەخ و کاڵ بکەنەوە. بە پاساوی ئایدۆلۆژیی و کورتبینیی و کاردانەوەی مومارەساتی هەڵەی توندڕەوانی بەناو ئایینی. ئەو دەستانە لەژێر باڵی ئازادیی و تەساموحی ئاینیی کۆمەڵگەی کوردیدا ویستوویانە و دەیانەوێ خوێندنی ئایینی بە هەردوو جۆرەکەی کۆت و بەند بکەن و لە کارایی و گرنگیی و بەها مەعریفی و ئەخلاقییەکەی بهێننە خوارەوە.

ئاستی خوێندنی ئاینیی لە مزگەوت و قوتابخانەکانی سەر بە پەروەردە بەشێوەیەکی سەرنجڕاکێش دابەزیوە، نەک تەنها لە کوردستان لە زۆر وڵاتی تریش ئەم ڕاستییە بووە بە دیاردە، هۆکارەکەش دەگەڕێتەوە بۆ:

> **مەحاڵە مرۆڤ وەک خۆی بناسرێ بەبێ تێگەیشتن لە بیر و بڕوا ئاینییەکانیی و بەبێ چوونە ناو قووڵایی بیر و هزری ئایینی**

**یەکەم**: فراوانیی و قووڵی و دژواریی خوێندنی ئایینی، لەلایەکەوە بابەت و پرسەکانی فرەچەشن و بەربڵاون، لەلایەکی ترەوە سەرچاوەکانی ئاڵۆزن بە زمانێکی تایبەت و دژوار نووسراون، ئەمەش وادەکات کەمترین کەس ڕووی تێبکەن و تیایدا سەرکەوتوو بن.

**دووەم**: بوونی بەربەستی زمان و شێواز کەمیی بواری کار لە ژیانی ڕۆژانەی خەڵکدا بۆ دەرچووانی خوێندنی ئایینیی وایکردووە داوا لەسەر ئەم جۆرە خوێندنە نەبێ و سەرەنجام خەڵک ڕوونەکەنە ناوەندەکانی خوێندنی ئاینیی.

**سێیەم**: نارێک و پێکی لە تەوزیفی موڵکەکانی ئەوقافی شەرعیدا کە لە بنەڕەتدا بۆ خزمەت بە مزگەوت و پەرەپێدانی خوێندنی شەرعی و بەردەوامبوونی زانستی شەرعیی دانراون، ئەوەش بووەتە هۆکاری کەمبژێویی مەلا و فەقێ، واتە ئەو کەسەی دەیەوێ ببێتە مامۆستای ئاینیی دەبێ بە ژیان و گوزەرانێکی خوارتر لە خەڵکی ئاسایی بساچێنێ و بە تەمای ژیانێکی خۆش و فەنتازیی دنیای نوێ نەبێ، کە ئەمەش دەبێتە کۆسپ و ڕێگری ڕووکردنە خوێندنی ئاینیی و بە تێپەڕینی کات کەمبوونەوەی خوێندەوارانی ئایینی.

**چوارەم**: زاڵبوونی سروشتی چاولێکەریی و نەبوونی گیانی داهێنان و تازەگەریی، هۆکارێکی ترە بۆ کەمڕەواجیی خوێندنی ئاینیی، لەو ڕووەوە کە مرۆڤی ئەمڕۆ کائنێکی ڕەخنەگر و ئاڵۆزە و ئامادە نییە لە فەزای مەعریفەی ڕابردوووودا بژیی و دینیشی بەو مەرجە قەبووڵە کە لە کەشوهەوای ئەم سەردەمەدا هەناسە بدات و بیپەرژێتە سەر باس و خواسەکانی هەنووکەی مرۆڤ، نەک تەنها لە قاڵب و قاوغی پێشیناندا بژیی. هەربۆیە زۆر ئاساییە بەم نەزمەی ئێستای ناوەندە ئاینییەکان خەڵکانێکی کەم ڕوویان تێبکەن.

**پێنجەم**: سیاسەتگوزاریی فەرمیی پەروەردە کە بەرمەبنای پەراوێزخستنی خوێندنی ئاینیی دامەزراوە و کاتی خۆیشی ڕژێمی پێشووی بەعس پەیڕەویی دەکرد، هۆکارێکی سەرەکییە بۆ حاڵی پەژموردەی خوێندنی ئاینیی. بۆ ئەم سیاسەتگوزارییە هەڵەیە پاساوی لاوازیان زۆرە، بۆ نموونە ناتەبایی زانست و ئایین، ناتەبایی مەدەنیەت و ئایین، ناتەبایی مۆدێرنە و ئایین، یان دەڵێن ناوەندەکانی خوێندنی ئاینیی دەبنە لانکی توندڕەویی ئاینیی.

**شەشەم**: ئاڵنگاریی زۆر و زەبەند وان لە بەردەم خوێندن و خوێندەوارانی ئاینیی کە هەر جۆرە ڕیفۆرمێک لەم بوارەدا پەیوەستە بە زاڵبوون بەسەر ئەم ئاڵنگارییانەدا، کە لێرەدا بە کورتی و بە پوختی ئاماژەیان بۆ دەکەم:

- نەبوونی فەلسەفەیەکی ڕوون بۆ خوێندنی ئایینی وایکردووە زۆر کەس نەزانێت ئەم خوێندنە چ سوود و بەهاو کارابییەکی هەیە؟
- زۆرێک لە پرۆگرام و کتێبەکانی خوێندنی ئاینیی پێویستیان بە تازەگەریی و گونجاندن هەیە لەگەڵ ئاستی تێگەیشتنی نەوەی ئەم سەردەمە بە تایبەت کتێبەکانی فیقهو کەلام و زمان. مەبەستم ئەوە نییە کە سەرچاوە ڕەسەنەکان فەرامۆش بکرێن یان بخرینە لاوە، بەڵکوو مەبەست دووبارە نووسینەوەی ئەو سەرچاوانەیە بە زمانێکی سەردەمییانەی دوور لە ئاڵۆزیی و داخران.
- هەژموونی عەقڵیەتی چاولێکەریی و داخراوی زۆرێک لە خوێندەوارانی ئاینیی وایکردووە خەڵکێکی زۆر لە خوێندنی ئاینی قوتار ببن و ئامادەی وەرگەرتنی نەبن، ئەم عەقڵیەتە لە زۆر ئاست و شوێن ڕەنگیداوەتەوە و بووەتە کێشەی جیددی بۆ هەموو ڕیفۆرمێکیش لەناو موسوڵماناندا.
- کێشەی نەبوونی ژمارەی پێویستی مامۆستای وانەبێژ بۆ زانستە بالاکانی وەکوو کەلام و عەقیدە و ئصوول و لۆجیک و تەفسیر و فەرموودە و بابەتە گرنگەکانی تر، کە بەبێ مامۆستای پسپۆڕ و کارکوشتە مافی خۆیان پێنادرێت.
- نەبوونی دوارۆژی ڕۆشن بۆ دەرچووانی خوێندنی ئاینیی وایکردووە هەم خەڵک و

هەم دەسەڵات لە بوونی ئەم خوێندنە سارد ببنەوە و هیوایەکی ئەوتۆیان پێی نەبێ.

- هەبوونی چەند بیروباوەڕ و فەلسەفەی بەدیل لە کۆمەڵگە و میدیایەکی زەبەللاحی دژ بە ئایین لە دنیا و لە ناوچەکە، هەروەها پەرتەوازەیی و پاشاگەردانیی ناو خوێندەوارانی ئاینیش هێندەی تر مەودا و بواری ئەم خوێندنەی تەسک و پڕ لە کێشە کردووە.
- پلان و نەخشەی نامۆی جۆراوجۆری ناوخۆیی و دەرەکی لە دژیی ڕموززی عیلمی و زانستی، هەروەها نەبوونی هوشیاریی پێویست بۆ ڕووبەڕووبوونەوەیان وایکردووە خویندنی ئاینیی دەرفەتی بیرکردنەوە و تێڕامانی پێویستی نەبێ بۆئەوەی لە کەشێکی ئارامی دوور لە ئینفیعالدا بەرنامەی ڕیفۆرم بۆ خۆی دابنێ و هەرچی دەیکات کورتبڕ و بێ ئەنجام بێت.
- نەبوونی سەرمەشق و نموونەی کردەیی و زیندوو لە بواری خوێندنی ئاینییدا هەتا نەوەی نوێ بیکەنە ئامانج و هەوڵ بدەن لە داهاتوودا وەک ئەوان بن. لەلایەکەوە بەدەستی نەزانانی ناوخۆیی و ناحەزانی دەرەکیی سەرمەشق و نموونە باشەکان دەشکێنرێن و، لەلایەکی ترەوە ڕێگە نادەن نموونەی باش و سەرمەشقی تازە دەربکەون، کە ئەمەش وا دەکات خوێندنی ئاینی لە ئەڵقەیەکی داڕزاودا بێت و بچێت.
- کێشەی شوناس و ئینتیمای تاکی کوردی وایکردووە لەم دنیا پڕ لە مادییەتە سەیر و سەمەرە و ئاڵۆزەدا بە ئاسانی نەتوانێت خۆی ساغ بکاتەوە و گرنگیی پێویست بدات بە شوناسی ئایینی خۆیی و لە ئەنجامدا وەکوو ئەوەی شایستەیە نەیپەرژێتە سەر خوێندنی ئایینی.
- ئالنگارییەکی تر ئەوەیە کە هەمیشە لە نێوان نەخشە و پراکتیزە کردندا مەودایەکی فراوان هەیە، کە ئەوەی ئێمە لە خولیا و هیواماندا پەروەردەی دەکەین سەبارەت بە خوێندنی ئاینیی کە دێینە سەر پیادە و جێبەجێکردنی دنیایەک کۆسپ و گرفتی بۆ دروست دەبێت و ئیمکانی سەرگەرتنی نەخشە و پلانەکانمان کەمدەکاتەوە، واتە کاتێک دەمانەوێ گرنگیی بە خوێندنی ئاینیی بدەین و پێمان وایە تەنها لەبەر خوا ئەم کارە دەکەین دەبینین زۆر کەس بەناوی خواوە، بەڵام بە پاڵنەری هەوا و هەوەسی خۆیان دەبنە لەمپەر و هەوڵی شکاندن و شکست پێ هێنانی دەدەن.

لەگەڵ بوونی ئەم ئاڵنگارییانە و کۆسپی تریش دەبێ خوێندەوارانی ئایینی سوور بن لەسەر پەیام و ئەرکی خۆیان و بڕوایان بە جەدوای کارەکەیان هێندە پتەو بێت کە هەموو ئەم ئالنگارییانە بگۆڕن بۆ دەرفەتی سەرکەوتن گەشەپێدان.



پرۆفیسۆر د.ئاراس محەمەد صاڵح

# بۆچی زانایانی کورد گرنگییان بە بوارە جیاوازەکانی مەعریفە نەداوە؟

ئەوەی جێگەی ستایشە لەدوای مسوڵمانبوونی کوردەوە، لەژێر کاریگەری ئایینڕا لە هەموو کوردستاندا هەزاران مزگەوت کراونەتەوە و وەک پێویستییەکی ئایینی بە تەنیشت زۆرێک لە مزگەوتەکانەوە، یان لەناو مزگەوتەکاندا خوێندنگە کراوەتەوە، لە خوێندنی زانستە ئیسلامییەکاندا پێویست بووە لەسەر فەقێی کورد فێری زمانی عەرەبی ببێت، بۆ ئەم مەبەستەش پێویستی کردووە هەموو لقەکانی زمانی عەرەبی بە نەحو صەرف و بەلاغەوە بخوێنێت. لە قۆناغێکی تردا و بەپێی پێویستی ڕۆژگار و گەشەکردنی بارودۆخەکە، زانستەکانی کەلام و لۆژیک و زمانەکانی فارسی و تورکی خوێندراوە، بەڵام ئەوەی جێگەی سەرنجە تا ئاستێکی باش لەگەڵ فرەڕەنگی میتۆدی خوێندندا، هەتا کۆتاییەکانی سەدەی نۆزدە ناوەندە زانستییەکانی کوردستان کەمتر لایان بەلای بابەتەکانی دەرەوەی زانستە ئایینییەکاندا کردووەتەوە، وەک بابەتەکانی مێژوو و جوگرافیا و تۆماری یاداشت و بیرەوەری و زۆر بابەتی تری کۆمەڵایەتی.

ڕەنگە کەسێک بڵێت ئەو بابەتانە نەخوێندراون و جێگەی بایەخی ناوەندە ئاینییەکان نەبووە، بەڵام هەر ئەم میتۆدە لە شارەکانی دیمەشق و قاهیرە و بەغداد خوێندراوە، لەگەڵ ئەوەشدا دەیان و سەدان مێژوونووس و جوگرافیناس و گەڕیدەی بە سەلیقە و کۆمەڵناسی وەک ئیبنوخەلدون و دەیان کیمیاگەر و پزیشکی میللی و کەسانی بەتوانای تریان تێدا هەڵکەتووە و خزمەتی زۆری مەعریفەی مرۆییان کردووە.

بۆ پشتگیری ئەم بۆچوونەمان کە زانا و خوێندەواری کورد گرنگی و بایەخی بە بابەتێکی گرنگی وەک مێژووی ڕوداوەکان نەداوە، لە کۆتاییەکانی سەدەی هەژدە و سەرەتاکانی سەدەی نۆزدەدا شارێکی گرنگی وەک قەڵاچوالان کە پایتەختی میرنشینێکی گرنگی وەک بابان بووە جێگۆڕکێی پێکراوە بۆ شوێنی نوێ و شارێکی وەک سلێمانی بنیاتنراوە، بەڵام ئەم ڕووداوە گرنگە لەلایەن مەلایەک، یان خوێندەوارێک، یان میرێکی کوردەوە تۆمار نەکراوە، ئەگەر کەسێک بەهۆی لەدایک بوونی مناڵەکەیەوە ئەو ڕووداوەی باس کردبێت، ئەوە هیچ لەم بۆچوونەی ئێمە کەم ناکاتەوە.

**بە درێژایی مێژووی خـوێندنی ئایینی لـە کـوردستاندا دامەزراوەیەکی سەربەخۆی خوێندن و زانستی نەبووە، بەڵکو تەنها گۆشەی مزگەوتەکان بوون و تێچووی ئەم پرۆسەیەش لەسەر شانی خەڵکە ئاساییەکە بووە.**

لەگەڵ ئەوەشدا لەو ڕۆژگارەدا قەڵاچوالان ناوەندێکی گرنگی خوێندەواری بووە، ژمارەیەکی بەرچاو زانای گەورەی تێدا بووە، کتێبخانەی و دەستنووسخانەی بابانی تێدا بووە، میرەکانی بابان هەریەکە لە ئیبراهیم پاشا و عەبدولڕەحمان پاشا و مەحمود پاشا خوێندەوار بوون، بەشێک لە ژیانیان لە بەغداد بەسەربردووە، مەحمود پاشا لای زانایانی حەیدەری لە شاری بەغداد خوێندوویەتی، بەڵام ڕووداوێکی گرنگی وەک گواستنەوەی پایتەختی بابان لە قەڵاچوالانەوە بۆ سلێمانی و دروستکردنی شارێک وەک سلێمانی کە ڕووداوێکی گرنگ بووە، تۆمار نەکردنی ئەم ڕووداوە و هەزارانی تر جێگەی پرسیارکردن و لەسەر وەستانە.

ئەوە جێگەی سەرنجە کەسێکی سەرۆک هۆزی وەک کەریم بەگی فەتاح بەگی جاف لە سەرەتای کتێبەکەیدا لەمبارەوە وتویەتی: (ئەمەش بەواسیتەی ئەمەوەیە کە ئومەرا و پاشاکانی کورد موبالاتیان بە تەئریخی کورد نەکردووە). بۆ پشتگیری بۆچوونەکەی کەریم بەگی جاف، کاتێک لە ساڵی (١٨٢٠ز) گەڕیدەی بەریتانی (ڕیچ) کە سەردانی سلێمانی کردووە، پرسیار لە مەحمود پاشا دەکات لەبارەی مێژووی بابانەوە، مەحمود پاشا لەوبارەوە بەبێ بایەخ سەیری ئەو مێژووی کردووە و جێگەی بایەخی نەبووە، بەڵام ڕیچ وەک ئەورووپیەک لەو ڕۆژگارەدا ئەو مێژووەی بەلاوە گرنگ بووە، ئاگاداری مێژووی بابانەکان بووە و قسەکەی مەحمود پاشای نەسەلماندووە.

کاتێک کەسێکی وەک شەرەفخانی بەدلیسی کتێبی (شەرەفنامە)ی نووسیوە، بە فەرمانی شای صەفەوی بووە، نەک خواستی خۆی، ئەگەر میرە کوردەکان ناوبەناو کەسێکی خوێندەواریان ڕاسپاردایە مێژووی ڕووداوەکانی کوردستان و جوگرافیای گوند و بنەماڵە و میرەکان و زمان و مێژووی پیاوە گەورەکان و شاعیران و بوێژانی کورد بنووسنەوە، ئێستا دەیان و سەدان شاکاری وەک شەرەفنامە لە کتێبخانەکاندا دەبوون و وەک ئاوێنەیەک ڕابردوویان پیشان دەدایِن.

بەپێی بۆچوون و لێکدانەوەی ئەوانەی لەسەر ئەم بابەتەیان نووسیوە، کۆمەڵێک فاکتەر کاریگەریان هەبووە لەسەر توێژی خوێندەوار و دەستەبژێری کورد کە گرنگی بە مێژووی خۆیان و وڵاتەکەیان نەدەن و لەو مێژووە درێژەدا مەلایەک یان میرزایەک قەڵەمی نەخستووەتە سەر کاغەز و چەند لاپەڕەیەک لە یاداشت و بەسەرهاتی خۆی بۆ نەوەکانی دوای خۆی تۆمار نەکردووە، لە گرنگترین ئەو هۆیانە:

**یەکەم**: دواکەوتوویی نەخوێندەواری میللەت: نووسین پێویستی خوێنەر دەیخولقێنێ و بەرهەمی دەهێنێ، بەڵام ئەگەر خوێنەر نەبوو، یان کەسانێک نەبوون نرخی نووسین بزانن بۆچی بنوسرێت؟ میللەتی کورد شاری گەورە و توێژی خوێندەواری زۆری نەبووە، کۆمەڵێکی کشتوکاڵی سەرەتایی بووە، ئەوەندەی پێویستی بە نووسین و کتێب هەبووە بچێتە لای مەلایەکی گوندەکەی، یان هۆزەکەی و پرسیارە شەرعییەکانی خۆی لێ بکات، لەوە زیاتر ئەو شتانەی بە زیاد زانیوە و جێگەی بایەخی نەبووە.

توێژی خوێندەواری کوردیش لەناو کۆمەڵێک وەهادا ئەوەندە ئاسۆی بیر و ئەندێشەی فراوان نەبووە و بێت بیر لە داهاتوو بکاتەوە و لاپەڕەکانی مێژوو بۆ داهاتوو تۆمار بکات، توێژی خوێندەوار چینێکی مام ناوەند یان خوار مامناوەند بوون، ئەوەیان خوێندووە و وتووە لەناو کۆمەڵ و گوند و خێڵەکاندا بژێوی خۆیان دابین بکات، لەوە بەولاوە نە جێگەی میللەت بووە، نەجێگەی خەمی توێژی خوێندەوارەکان بووە.

**دووەم**: دووری لە مەڵبەندە شارستانییەکانی وەک بەغداد و شام و قاهیرە: بەشێوەیەکی گشتی کوردستان ناوچەیەکی دابڕاو لاچەپ بووە لە ناوەندە گرنگەکانی خوێندەواری ئەو ڕۆژگارەوە، زانایانی کورد هەتا لە کوردستان بوون ناوبانگ و گەورەیی و پێگەی زانستیان دەرنەکەوتووە، چونکە لەناو کۆمەڵێک نەخوێندەواردا نەتوانراوە ئاستی زانستیان دیاری بکرێت، بەڵام کاتێک کۆچیان کردووە بۆ دەرەوەی کوردستان زیاتر پێگەی زانستیان دەرکەوتووە و ئاسۆی بیریان فراوانتر بووە، مەولانا خالیدی نەقشبەندی و مەلا عەبدوڵڵای بێتووشی و نالی و حاجی قادری کۆیی و مەلا عەبدولکەریمی مودەڕیس و دەیانی تر نمونەی ئەم بۆچوونەن.

**سێیەم**: لاچەپی و دوورە دەستی لە ڕێگای کاروان: لەبەرئەوەی کوردستان نەکەتووەتە سەر ڕێگای بازرگانی گەورە و ڕێگای هاتوچۆی دەریایی نەبووە و وڵاتەکەشی نەبووەتە بازاڕێکی گەورە بۆ ساغکردنەوەی بەرهەمی بێگانە و لەهەمانکاتدا کاڵاکانی خۆی ڕەوانەی بازاڕە گەورەکانی شام و بەغداد و ئەستەنبوڵ و بەغداد کردووە و بۆ ساغبوونەوە، بازرگانە بێگانەکان کەمتر هاتوونەتە کوردستان، تێکەڵاونەبوونی بە کەلتووری جیاواز وایکردووە گۆڕان و گەشەکردنی کۆمەڵایەتی زۆر دوابکەوێت و جێگەی بایەخی تاکی کورد نەبێت.

**چوارەم**: نەبوونی هیچ دامەزراوەیەکی مەعریفی سەربەخۆ لەو ڕۆژگارەدا: بەدرێژایی مێژووی خوێندنی ئایینی لە کوردستاندا دامەزراوەیەکی سەربەخۆی خوێندن و زانستی نەبووە، بەڵکو تەنها گۆشەی مزگەوتەکان بوون و تێچووی ئەم پرۆسەیەش لەسەر شانی خەڵکە ئاساییەکە بووە، نە دەوڵەتێکی بەهێز بووە لە کوردستاندا پشتگیری پرۆسەی خوێندن بکات، نە میر و دەسەڵاتدارێکی پشتگیری کردووە، تەنانەت لە هەندێ ناوچە تووشی ڕێگری بووەتەوە، هەموو ئەمانە وایکردووە توێژە هەژارەکە ڕووبکەنە خوێندن، کاتێکیش خوێندنیان تەواوکردووە و ناوەندێکی زانستی نەبووە و تواناکانیان تێدا تەوزیف بکرێت، هەموو ئەمانەش هۆی ئەوەبووە و توانا زانستی و ڕۆشنبیری و ئەدەبیەکانیان بەرەو پوکانەوە بچێت و گەشە نەکات.

**پێنجەم**: میتۆدی خوێندن و مەنهەجی تایبەت: میتۆدی خوێندن چڕکراوەتەوە لە بابەتەکانی زمانی عەرەبی و فیقهو هەندێ بابەتی زمانی فارسی و زانستی کەلام، ئەم زانستانەش ئەوەندەی لەبارا بووە کە ئیمام و پێشنوێژێک بۆ خەڵکە ئاساییەکە بەرهەم بهێنێ، نەخوێندنی بابەتەکانی مێژوو و ژیانی پێغەمبەر(د.خ)و هاوەڵانی و بابەتە گرنگەکانی تر، هەموو ئەمانەش هۆی ئەوەبوون و زۆرجار واعیزێکی بەرهەمهێناوە و ئەوەندەی بە زمانی خورافە قسەی کردووە، زۆر کەمتر کاری لەسەر ڕۆشنکردنەوەی بیر و ئەندێشەی خەڵکی کردووە.

کەسێکی هۆشیاری وەک حاجی قادری کۆیی کاتێک لە نیوەی دووەمی سەدەی نۆزدەدا چووەتە شارێکی گرنگی فەرهەنگی وەک ئەستەنبوڵی ئەو ڕۆژگارە ڕەخنەی توندی لە میتۆدی خوێندنی ناوەندە ئایینییەکانی کوردستان گرتووە و ئەڵێ:

**شاعیر و شێخ و خواجە دەربەدەرن**

**لە قسەی بێ نەتیجەدا دەمرن**

**باسی زوڵفی درێژ و چاوی بەخەو**

**نەبڕاوە بووە تڕی خوسرەو**

**قەید و تەزبیب و حاشیە و ئیعراب**

**هەموو با بردی بوونە مەوجی سەراب**

حاجی قادر دوای ئەوەی تێکەڵاوی فەرهەنگی گەلان جیاواز بووە لە ئەستەنبوڵدا، فرەڕەنگی مەعریفیی و سەرەتاکانی شارستانی ئەورووپای بەچاوی خۆی بینیوە، داوای کردووە کە بەرنامەی خوێندن تەنها لە بابەتی زمانی عەرەبیدا (الاعراب)دا قەتیس نەکرێت و بابەت زانستییە نوێیەکانیش بخوێنرێت، هەتا ئێمەش وەک گەلانی دنیا بەرەو پێشەوە هەنگاو بنێین، چونکە پێشکەوتنی تەنها لە خوێندەواریدا بینیوەتەوە.

**ئێستە مەعلومی بوو هەموو میللەت**

**ئەی مەلای دەرس و موفتیی ئومەت**

**قەید و تەزبیب و شەرح و حاشیەکان**

**بوونە سەدی مەعاریفی کوردان**

جارێکی تر حاجی قادر لە ڕۆژگاری خۆیدا ڕوویکردووەتە توێژی دەستەبژێر و خوێندەواری کورد، کە ئەوانیش مەلا و موفتی و مودەڕیسەکان بوون، پێیان دەڵێت: ئێستا هەموو میللەت بۆی ڕوونبووەوە کە خوێندن و پێشکەوتن تەنها لە ڕێگەی کتێبەکانی نەحو و صەرف و فیقهەوە نایەتەدی، بەڵکو پێویستە گرنگی بە زانستی نوێ بدرێت و تەنها بە یەک پرۆگرام و پسپۆڕی ناتوانرێت پێشکەوتنی وڵات و میللەت بێتەدی.

**شەشەم**: نەبوونی کاغەز پێویستییەکانی نووسین: هەژاریی و دوورە دەستی خوێندنگەکانی کوردستان لە شارە گەورەکانی ئەو ڕۆژگارە، ئەمە زیاتر ئەرکی فەقێی و مامۆستای کوردی سەختکردووە، هەتا کتێبێکی دەستنووس و مەرەکەب و دەفتەرێکیان دەستکەوتووە خوێنیان بووە بە ئاو، لە بارودۆخێکی وەها سەخت و دژواردا زۆر زەحمەتە بیر لە نووسینی یاداشت و مێژوو و جوگرافیا و کۆکردنەوەی قسەی نەستەق و بەسەرهاتی کورد بکرێتەوە، بێگومان ئەم دەستکورتییە لە بواری پێویستییەکانی خوێندندا ڕۆڵی گەورەی هەبووە لە گەشەنەکردن و دواکەوتوویی باری مەعریفی کۆمەڵی کوردەواریدا.

**حەوتەم**: سووتانی کەلەپووری نووسراوی کورد: نائارامی سیاسیی و هەموو ئەو هێرشە  کاولکارییانەی تووشی کوردستان هاتووە، کاریگەری گەورەی هەبووە لەسەر دواکەوتن و نەبوونی دڵنیایی و پێشنەکەوتنی ئاستی فکریی و ڕەوشی خوێندەواری و کۆمەڵایەتی لە هەموو کوردستاندا، جگە لە سوتان و لە ناوچوونی کەلەپووری نووسراوی نوسەر و مەلا و میرزادەکان، لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا ئەوەی لە سووتاندن ڕزگارکراوە لەلایەن لەشکری بێگانەوە براوە و تالان کراوە و ئاودیوی ئەودیو سنوورەکانی کوردستانیان کردووە.

**هەشتەم**: نووسینی بە زمانی بێگانە: خوێندن بە زمانی دایک بۆ هەر تاکێک گرنگی و بایەخی خۆی هەیە، منالْ ئەوەندەی لە ڕێگەی زمانی دایکەوە دەتوانێت بیر و ئەندێشەی بجولێت لەڕێگەی زمانی ترەوە ئەو کاریگەرییەی نابێت، هەربۆیە پسپۆڕانی پەروەردە زۆر جەخت لەسەر زمانی دایک دەکەنەوە لە سەرەتای پرۆسەی خوێندندا، خوێندنگە ئاینییەکانی کوردستان بایەخیان بە زمانی کوردی نەداوە، زمانی کوردیش لەو ڕۆژگارەدا دەرەتانی ئەوەی نەبووە بکرێتە زمانی زانستەکان، هەربۆیە زمانی پیرۆز و سەردەست لایان تەنها زمانی عەرەبی بووە، لەگەڵ خوێندنی هەندێک لە زمانی فارسی، زمانی بێگانەش ئەو ئاسۆ فکرییەی لای خوێندەواری کورد دروست نەکردووە، هەتا بتوانێت کەلەپووری نەتەوەی خۆی بەو زمانە تۆمار بکات لە فەوتان ڕزگاری بکات، شاعیرێکی هۆشیاری وەک حاجی قادری کۆیی ئەڵێ:

**هەر کوردە لە بەینی کوللی میللەت**
**بێ بەهرە لە خوێندن و کیتابەت**
**بێگانە بە تەرجەمەی زوبانی**
**ئەسراری کتێبی خەڵقی زانی**
**یەکسەر عولەما درشت و وردی**
**نایخوێننەوە دوو حەرفی کوردی**

حاجی قادری کۆیی نەنووسینەوەی مێژووی کورد و ونبوونی ناوی زانا و میر و شاعیرانی کورد گێڕاوەتەوە بۆ ئەوەی کە بە زمانی زگماکی دایکی نەیخوێندوە و نەینووسیوە، ئەگەر خوێندەواری کورد بە قەڵەم و کاغەز و و دەفتەری بە زمانی کوردی بنووسیایە، بێگومان هەتا ڕۆژی قیامەت و ناونیشان و مێژوویان بە زیندووی دەمایەوە، لەمبارەیەوە وتویەتی:

**کتێب و دەفتەر و تەئریخ و کاغەز**
**بە کوردی گەر بنوسرایە زوبانی**

**مەلا و شێخ و میر و پادشامان**
**هەتا مەحشەر دەما ناونیشانی.**

بەلای حاجی قادرەوە نەنووسینەوەی مێژووی کورد و ونبوونی ژیان و بەرهەمی نووسەران و شاعیران و ئەدیبان کورد دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە بەرهەمی زانایان و دانایانی کورد بە زمانی خۆیان نەبووە، ئەوەشی نووسیویانە دوای ساڵانێک بووەتە کەلەپوور و بەرهەمی ئەو گەلانەی کە بە زمانی ئەوان نوسراوەتەوە، تەنانەت خۆشیان کراون بە کوڕی ئەو نەتەوانە و بوون بە بەشێک لە مێژووی زانستی و خوێندەواری ئەوان.

**نۆیەم**: وەک پێویست ئیش لەسەر دەستنووسەکان نەکراوە: ئەوەی جێگەی باسە لێرەدا لە کوردستاندا کتێبخانە و ئەرشیفخانە و دەستنووسخانە نەبووە، هەتاکوو ئێستاش شوێنێکی وەها نیە لە هەموو کوردستاندا هەتا بەرهەمی بیر و ئەندێشە و دەستخەتی زانا و بەهرەمەندانی کوردی تێدا کۆبکرێتەوە، ئەمەیش هۆیەکی سەرەکییە کە دەستخەت و نووسراوی زۆرێک لە زاناکانمان پەڕاگەندەی وڵاتان ببێت و لەکاتی ئێستادا بە ئاسانی نەدۆزرێنەوە کاری لێکۆڵینەوەیان لەسەر نەکرێت.

هەروەها هەتا ئێستا هەزاران دەستخەت و لاپەڕە و سیپارە و نووسراوی زانایانمان هەیە لە گۆشەی کتێبخانە و لەناو ماڵاندا هەڵگیراون و پارێزراون، هەموو ئەو بەرهەمانە نەکەوتوونەتە دەستی توێژەران و ناوەندە ئەکادیمییەکان، هەتا لێکۆڵینەوە لەبارەیانەوە بکرێت بکەونە بەردەستی خوێنەران، بۆئەوەی بزانین پێشینەکانمان چیان بۆ تۆمارکردووین لە شیعر و ئەدەب و مێژوو، هەتا لەڕێگەی نووسینەکانیانەوە ئەو بەهرەمەندانە بناسین و لەلاپەڕەکانی مێژووی مرۆڤایەتیدا ناویان بە زیندووی بمێنێتەوە.

ئەوەی تێبینی دەکرێت لە کۆتاییەکانی سەدەی نۆزدە و سەرەتاکانی سەدەی بیستەمدا بەهۆی کرانەوەی قوتابخانەی نوێ و بەتایبەتی مەکتەبی ڕوشدییەی سەربازیی و موڵکی لە بەشێک لە شار و شارۆچکەکانی کوردستاندا گۆڕانی فیکریی و مەعریفی لە کوردستاندا هاتووەتە پێشەوە، دەرچووی ئەو خوێندنگایانە لە ماوەیەکی پێوانەیی کەمدا دەتوانن بوونی خۆیان لە هەموو ناوەندەکانی ژیانی گشتیدا بسەلمێنن.

دەیان مونەوەری وەک محەمەد ئەمین زەکی بەگ و جەمال عیرفان و مستەفا پاشای یامولکی و ڕەفیق حیلمی و پیرەمێرد و تۆفیق وەهبی و چەندانی تر، ئەم مونەوەرانە و هاوڕێکانیان توانیویانە لە ناوەندە ڕۆشنبیریی و ڕۆژنامەنووسی و سیاسی و کۆمەڵایەتییەکەدا بەرهەمی نوێ پێشکەش بکەن و گۆڕانی گەورە لە زیهن و بیر و ئەندێشەی خەڵکیدا دروست بکەن، بەهۆی هەژموونی ئەم ڕووناکبیرانەوە توێژی دەرچووی خوێندنگە ئاینییەکان پاشەکشە دەکەن و پێگەی گرنگی خۆیان لەدەست دەدەن.

هەروەها بەهۆی کۆچی بەشێک لە خوێندەوار و دەستەبژێری کوردەوە بۆ شارە گەورەکانی وەک بەغداد و تەواوکردنی خوێندنی زانکۆیی لەلایەن ژمارەیەکییانەوە، ئەمانەش گۆڕانی گەورە لە دیدگاو دنیابینی و ڕۆشنبیریاندا ڕوویداوە، لە نمونەی ئەمانە عەلادین سەجادی و محەمەد قزڵجەیی و مەلا عەبدولکەریمی مودەڕیس و محەمەد عەلی قەرەداغی و چەندانی تر، ئەمانیش لەژێر کاریگەری کەلتووری بەغداد و ئەو ژینگە ڕۆشنبیرییەدا، ڕوویان کردووەتە کاری نووسینی هەمەجۆر و بواری ڕۆژنامەنووسی و ڕادیۆ و لەو بوارانەدا خزمەتی بەرچاویان کردووە.

لەگەڵ هەموو بەربەستەکان و دەیان هەڵدێر و ناخۆشی و نائارامی سیاسیی و هەژاریی و دواکەتوویی، بەڵام مەلا و فەقێی کورد نزیکەی هەزار و چوارسەد ساڵ درێژەی بە خوێندن و فێربوون ئایینداری داوە، لەوپێناوەشدا قوربانی زۆریداوە و هەموو ناخۆشی و نەبوونی و دەردیسەرییەکی قبوڵکردووە، لەو بارودۆخە سەختەدا توانیویەتی مێژوویەکی گەورە لە شیعر و ئەدەب تۆمار بکات و دەیان سەدانی وەک خانای قوبادی و مەولانا خالیدی نەقشبەندی و نالی و سالم و کوردی و مەولەوی و مەحوی و مەلا عەبدوڵڵای بێتووشی و شێخ مارفی نۆدێی و مەلا عەبدولکەریمی مودەڕیس و مەلای گەورەی کۆیە و شێخ محەمەدی خاڵ پێبگەیەنێ و دەیان دیوانی شیعری بەپێز و بەهێز پێشکەش بە کتێبخانەی ئەدەبی بکەن.

## سەرچاوەکان


- کەریم بەگی فەتاح بەگی جاف، تەئریخی جاف، چ١، بەغداد، ١٩٩٥.
- کلاودیۆس جێمێس ڕیچ، گەشتی ڕیچ بۆ کوردستان، وەرگێڕانی محەمەد حەمەباقی، چاپی یەکەم، دەزگای ئاراس، هەولێر، ٢٠٠٢.
- محەمەد عەلی قەرەداغی، في رحاب أقلام وشخصيات كردية، الطبعة الأولى، بنکەی ژین، سلێمانی، ٢٠٠٧.
- حاجی قادری کۆیی، دیوانی حاجی قادری کۆیی، لێکدانەوەی سەردار حەمید میران و کەریم مستەفا شارەزا و محەمەدی مەلا کەریم، سەعید کەرەمی، چاپی دووەم، بڵاوکراوەی کوردستان، سنە،١٣٩١هەتاوی.



رێدار ئەحمەد

# خوێندنی ئایینی لە کوردستان
# لە دیدی دکتۆر مستەفا زەڵمیدا



## «بەڕاستی باوەڕ ناکەم لە سەدەی بیستەمدا کەس هەبێ هێندەی من ناخۆشی و ناهەمواری خوێندنی دیتبێ.»

خوێندنی ئایینی لە کوردستاندا ڕیشەیەکی قوڵی هەیە و خوێندنگە ئایینییەکان چەندین زانای گەورەیان لە بوارە جیاوازەکاندا پێشکەشی کۆمەڵگەی کوردی کردووە، بۆیە کاتێ ئاوڕ لە ژیاننامەی ناسراوترین سەرکردە سیاسییەکان، بەناوبانگترین شاعیر و ئەدەبیەکان، زاناترین زانایانی ئایینی دەدەینەوە دەبینین پەروەردەی خوێندنگە ئایینییەکانن.

دکتۆر مستەفا زەڵمی (١٩٢٤-٢٠١٦) یەکێک لەو زانا ناودار و ناسراوانەی جیهانی ئیسلامییە کە پەروەردەی مزگەوتە و توانیوویەتی خزمەتی بەرچاو لەسەر ئاستی جیهانی ئیسلامی لە چەندین بواردا پێشکەش بکات، (کاروانی ژیانم) کە ژیاننامەی دکتۆر مستەفا زەڵمییە گەنجینەیەکی پڕ بەهایە لەپاڵ بەرهەمە ناوازەکانی دیکەیدا جێگای وردبوونەوە و سوودلێوەرگرتنە، یەکێک لەو بابەتانەی لە کاروانی ژیانمدا ئاوڕی ڕەخنەگرانەی لێدراوەتەوە بریتییە لە خوێندنی ئایینی و خوێندنگە ئایینییەکان، لەم بابەتەدا هەوڵ دەدەم بەگەڕانەوە بۆ بیرەوەرییەکانی دکتۆر مستەفا زەڵمی و ئەزموونی شەش ساڵ خزمەتکردنی ئاوڕێکی خێرا لەم بابەتە بدەمەوە.

دکتۆر مستەفا زەڵمی سەرەتای بەرگی یەکەمی کتێبی (کاروانی ژیانم) بە باسکردنی سەردەمی فەقێیەتی خۆی (١٩٣٤-١٩٤٦) دەستپێدەکات، پاش خستنەڕووی ئەو سەختی و نەهامەتییانەی لەپێناوی بەدەستهێنانی زانستە شەرعییەکاندا هاتووەتە ڕێگای و چۆنییەتی زاڵبوونی بەسەریاندا (کە ئەمەیان پێویستی بە تویژینەوە و بابەتی سەربەخۆ هەیە و لێرەدا جێی نابێتەوە) تا دەگاتە ئەوەی ئیجازەی دوازدە عیلمی وەردەگرێت و دەبێتە مەلا، لەپاڵ ئەم بڕوانامەیەدا کە ڕێزێکی زانستی تایبەت هەبووە دەچێتە خوێندنی فەرمیشەوە و بەتاقیکردنەوەی دەرەکی قۆناغی سەرەتایی تەواو دەکات و پاش پۆلی شەشی سەرەتای درێژە بەخوێندنی ناوەندی و دواتریش دواناوەندی دەدات تا لە کۆلێژی یاسا وەردەگیرێت و پاشان لە هەردوو بواری یاسا و شەریعەت لە عێراق و میسر دەبێتە خاوەنی سێ بڕوانامەی ماستەر و دوو بڕوانامەی دکتۆرا و بڕینی پلە زانستییەکان تا دەگاتە لوتکە کە ئەویش ئوستازی موتەمەڕیسە.

کاروانی ژیانم ساڵی ٢٠٠١ نووسراوە، واتە پاش ئەزموونێکی دەوڵەمەند لە بواری خوێندن و وانەوتنەوەدا بووە، لەم بابەتەدا پوختەی ئەو تێبینیانەی لەسەر خوێندنی قوتابخانە ئایینییەکان بەگشتی و مامۆستا و فێرخوازانی ئەم بوارە بەتایبەت دەخەینە ڕوو.

**خەسڵەتەکانی فێرخوازی زانستە ئایینییەکان**

خوێنەر بەڕامان لە کتێبی (کاروانی ژیانم) دەتوانێت ئەم خەسڵەتانە لە فێرخوازی زانستە ئایینییەکان بەدی بکات:

١. ئارامگر بێت: زانستە ئایینییەکان بەهۆی ئەوەی بەزمانی عەرەبین بۆ فێربوونیان پێویست بە هەوڵ و ماندووبوونی زۆر دەکات، ئەمانەش پێویستیان بە ئارامگری هەیە.

٢. فێرخواز لە خوێندنی ئایینیدا عەشقێکی هەبووە بۆ خوێندنەکەی، ئەو خۆشەویستی و ئەوینە وایلێکردووە هەردەم بەشوێن مەلای باشدا بگەڕێت کە زانستەکەیان فێر بکات نەک تەنها وانەیەک بێت و بخوێندرێت و نمرەی لەسەر وەربگیرێت، لە زانکۆکاندا ڕەنگە هەندێ جار گرفتی قوتابی ئەوە بێت هەڵبژاردنی مامۆستا لە دەستی خۆیدا نییە.

٣. زانستە ئایینییەکان پەیوەندییان بەژیانی دونیا و قیامەتەوە هەیە، فێرخوازی ئەم زانستانە فێربوونەکەی تەنها بۆ وەرگرتنی بڕوانامە نییە، بەڵکو ئەرکە سەختەکەی سەرشانی لەنێو کۆمەڵگادا لە پاش وەرگرتنی بڕوانامە دەستپێدەکات.

٤. خوێندنی ئایینی جاران لە کوردستان جیاوازییەکی جەوهەری هەبووە لەگەڵ ئێستا، لە قۆناغەکانی سەرەتای خوێندنی فەقێدا بۆ وەرگرتنی زانستەکان لای مامۆستایانێکی کارامە چەندین ناوچەی جیاواز گەڕاوە، ئەمەش لەڕووی فراوانبوونی بیرکردنەوە و تێکەڵبوونی خەڵکی جیاواز کە ئەو سەردەمە تێکەڵاوبوونی خەڵک بەمشێوەیەی ئێستا نەبوو، کاریگەری ئەرێنی لەسەر پێگەیشتنی هەبوو.

**تێبینییەکانی لەسەر خوێندنی مزگەوت**

ئەم تێبینیانەی لێرەدا دکتۆر مستەفا زەڵمی دەیانخاتە ڕوو بەشێکیان تایبەتن بەو سەردەمەی ئەو تێیدا لە مزگەوتدا خوێندوویەتی، لێرەدا وەک ئەوەی لە (کاروانی ژیانم)دا تۆماری کردوون دەیخەینە ڕوو، بەو ئومێدەی ئەگەر هەندێک لەمانە لە ئێستادا هەبن چارەسەر بکرێن.

«لە ماوەی (١٢)ساڵی خوێندنم لە قوتابخانە ئایینییەکاندا، هەندێک تێبینیم بۆ دروستبووە لەسەر خوێندنی حوجرە و لەم بەشەدا تۆماریان دەکەم:

**یەکەم**: جۆری وتنەوەی بابەتی منداڵ لە مزگەوتدا زۆر هەڵە بوو -وەک باسم کرد- زۆر ناڕەوا بوو، لە (١٠٠) منداڵ دووان دەردەچوون، هەندێک لەو مەلایانە یان ئەو میرزایانەی کە قوتابخانەیان دادەنا، توڵە هەنارێکی ئامادە دەکرد، یان بە زستاندا مقاشێکی سورەوەکراوی بەکاردەهێنا بۆ سزادانی ئەو قوتابییەی هەڵەیەکی دەکرد لە وشەیەکدا، ئەگەر جگەرەکێش بوایە جگەرەکەی دەنا بە پەنا گوێی منداڵەکەوە، وەک میرزا (فتح الله) جگەرەکەی نا بە پەنا گوێی (محەمەد)ی ئامۆزامەوە، مامیشم وتی ئەگەر ببیت بە ئیمامی شافعی نایەڵم بخوێنیت.

**دووەم**: قورئانی پیرۆز گرانترین کتێبێکە بە زمانی عەرەبی، لە هەموو دانراوێکی عەرەبی (بلیغ) تر و گرانترە، قوتابی بۆ یەکەمجار لەبری ئەوەی شتێکی ئاسانی پێ بڵێن، بۆماوەی یەک ساڵ تەنها قورئانی پیرۆزی پێ دەڵێن، ئەویش نەیدەزانی مانای وشەکانی ئەم قورئانە چییە، لەبەرئەوە زۆر قوتابی هەبوو هەر لە سەرەتاوە وازی لە خوێندن دەهێنا، قوتابی منداڵ وردە وردە گەورە دەبێت و بیرکردنەوەی گەشە دەکات، دەبێت لە ئاسانترین زانستەوە بچێت بۆ قورسترین زانست، قوتابی ئێستا لەناو قوتابخانەکاندا ڕێژەیەکی کەمی واز لە خوێندن دێنێت یان دەرناچێت، چونکە خوێندن پلە پلە سەردەکەوێت، بەپێچەوانەی خوێندنی مزگەوت کە ڕێژەیەکی زۆر کەم خوێندنی تەواو دەکرد.

لە دێی زەڵمدا بەتەنها من خوێندنم تەواوکرد، ئەویش لەبەر لاساریم و هەستم بە ئێش و ئازار نەکردنم، بەرگەی هەموو لێدانێک و هەموو توانجێکم دەگرت، بەرگەی سەرما و گەرما و برسێتی و دووریم دەگرت.

**سێیەم**: جۆری ژیانی فەقێ:

ئەوکاتە ئەو جۆرە ژیانە عەیب نەبوو لەبەر دوو شت:

١- لەبەرئەوەی عورف و عادەت بوو.

٢- لەبەرئەوەی فەقێ زۆر بەڕێز بوو لەسەر ئەو بنچینەیەی کە بۆ خوا دەخوێنێت و خزمەتی ئایین دەکات، هەموو ئێوارەیەک فەقێیەک وەک سواڵکەر دەگەڕا بە ماڵاندا هەر ماڵەی نانێکی دەدایە، یان لە بەهاراندا دەچوون بۆ دێهاتەکان و دەوارەکان دەگەڕان و ڕاتبەی کەرەیان دەکرد و دەیانفرۆشت بۆ کڕینی شەکر و چا، زۆرجار سەگ دەوەڕی و ئەو کولەکەیەی وەک گۆزە بەکاردەهێنرا بۆ هەڵگرتنی کەرێیەکە دەکەوت و کەرێیەکە لەگەڵ خاک و خۆڵەکە تێکەڵ دەبوو، ڕێسی فەقێ دەبووەوە بەخوری، باشتر بوو بەشێوەیەکی تر ئەو ئێشە بکرێت، یان یەکێک لە ئاواییەکە نانەکەی کۆ بکردایەتەوە، یان هەموو شتەکان لە جێگەیەک کۆ بکرایەتەوە.

**چوارەم**: جیاوازییەکی زۆر لە نێوان سوختە و مستەعددا هەبوو، بە جۆرێک کە مستعد سوختەی بە بەندە و خزمەتکار دەزانی و بەئارەزووی خۆی بەدڵی بوایە ڕای دەگرت یان دەری دەکرد، زۆرترین کاتی سوختە بە خزمەتکاری مستعد تەواو دەبوو، کە ئەمە نە لە ئیسلامدا هەیە و نەشتێکی مرۆڤایەتییە و جۆرێک بوو لە کۆیلایەتی.

**پێنجەم**: مەلای مزگەوت لەگەڵ فەقێکان لە ڕێگەی خوێندندا کاتێکی زۆر و ئازارێکی زۆر و هیلاکییەکی زۆریان دەکێشا، لەگەڵ ئەوەش بەرهەمەکەیان زۆر زۆر کەم بوو ئەگەر بەراوورد بکرێت لەگەڵ ماندووبوونەکەیان، بۆ نموونە ئەگەر مەلایەک چوار مستعدی هەبوایە هەریەکە بەتەنها کتێبێکی دەخوێند و ئەو مەلایە بۆماوەی دوو کاتژمێر

لەگەڵ خوێندنی ئەو فەقێیە خەریک دەبوو، واتە ڕۆژی بەلای کەمەوە هەشت کاتژمێر وانەی بەو چوار فەقێیە دەوتەوە، کە هەریەکە فێری یەک کتێب دەبوون، وتنەوەی ئەو کتێبە بە لای کەمەوە ماوەی یەک ساڵی دەبرد. ئەم جۆرە وانە وتنەوەیە گەورەترین هەڵە بوو، کە ماندووبونێکی زۆر بەرامبەر بە سودێکی کەم، ئەگەر ئەو مەلایە لە ماوەی (٨) کاتژمێر هەر چوار فەقێکە بەیەکەوە چوار ماددەی جیاوازی پێ بوتنایە، لە جیاتی (١٢) عیلمە دەبوون بە (٤) عیلمە، هەروەک خوێندنی کۆلێجەکان و پلەکانی تری خوارەوەی خوێندن لە سەرەتایی و ئامادەیی، جگە لەوە دەیتوانی ژمارەیەکی زۆرتر فەقێ فێر بکات.

لە زانکۆی ئەزهەر هەمان ئەو کتێبانەی مەلاکانی کوردستان دەیانخوێند دەوترایەوە، بەڵام بەشێوەیەکی ڕێکخراو بوو، (٥٠) قوتابی بۆماوەی یەک کاتژمێر گوێیان لە یەک مامۆستا دەگرت، زۆرتر بابەتی خوێندن و ژمارەیەکی زیاتر دەبوون، ئەم هەڵەیە هێشتا لە خوێندنی حوجرەی مزگەوتەکاندا هەرماوە.

**شەشەم**: گرنگی نەدان بە قورئانی پیرۆز و فەرموودەکانی پێغەمبەر و فیقهی ئیسلامی، هەرچەندە یەکەم کتێب دەخوێنرا قورئانی پیرۆز بوو، زۆر فەقێ هەبوو (١٢) عیلمەیان تەواو دەکرد بەبێ ئەوەی یەک لاپەڕە تەفسیری قورئان بخوێننەوە یان فەرموودەیەکی پێغەمبەر بزانن، وەک باسی خۆمم کرد، مەلا هیچی نەدەزانی لە بابەتی شەریعەتی ئیسلامەوە.

**حەوتەم**: ئەو مەلایانەی کە لە پاش مەلایەتی هەوڵیان دەدا بۆ خۆیان تۆزێک فێری فیقهی ئیسلام ببن، جگە لە مەزهەبی شافیعی -خوای لێ ڕازی بێت- نەیاندەویست فێری شتێکی تر ببن لە مەزهەبەکانی تر، لایان وابوو ئەوەی شافعی فەرموویەتی هەمووی ڕاستە، هیچ ڕۆژێک بیریان لەوە نەکردووەتەوە کە ئیمامی شافعی ئەم حوکمەی لە چ سەرچاوەیەکەوە هێناوە تا ئەمیش بچێت سەیری ئەو سەرچاوەیە بکات تا بزانێت قسەکەی ئیمامی شافعی ڕێی تێ دەچێت کە ڕاست بێت، یان مەلاکان دەیانتوانی حوکمی زۆر شت لەو خوێندنەی خوێندوویانە یان قورئانی پیرۆز یان فەرموودەکانی پێغەمبەر وەربگرن، ئیمامی شافعی (٥٤) ساڵ ژیاوە تەنها چوار عیلمی خوێندووە، کە بریتی بوو لە عیلمی(قورئان)، عیلمی(فەرموودەی پێغەمبەر)، علمی(أصول الفقه)، عیلمی (بلاغە)، کەچی مەلا (١٢) عیلمی دەخوێند و زیاتر لە ئیمامی شافعی دەژیا و زیاتر ئەم عیلمانەی بە خوێندن بەفەقێ دەوتەوە، کە پرسیاریان لێ دەکرد ئەگەر وەڵامی بدایەتەوە لە بۆچوونی ئیمامی شافعی زیاتر هیچی تری پێ نەبوو، قەت نەی دەوێرا بڵێت ئەمە ڕای خۆمە بەپێی قورئان.

هەرچی فەرموودەی ئیمامەکان هەیە (شافعی، حەنەفی، حەنبەلی، مالیکی، ظاهری، أباضی، شیعەی ئیمامی، شیعەی زەیدی)، هەموو ئەوانەی لە هاوەڵانی پێغەمبەرەوە وەرگیراون یان لەوانەی دوای ئەوان هاتوون، قورئانی پیرۆز و فەرموودەکانی پێغەمبەر

**مامۆستای ئایینی کوردستان، لەبەرئەوەی هیچ بەرهەمێکی لە (فقه)ی ئیسلامی بەجێ نەهێشت و لە زۆر مانای قورئانی پیرۆز تێ نەگەیشت، کە کۆچی دوایی دەکرد وەك چرایەکی ڕووناك دەکوژایەوە.**

بە ئاشکرایی باسی کردوون.

مامۆستای ئایینی کوردستان، لەبەرئەوەی هیچ بەرهەمێکی لە (فقه)ی ئیسلامی بەجێ نەهێشت و لە زۆر مانای قورئانی پیرۆز تێ نەگەیشت، کە کۆچی دوایی دەکرد وەک چرایەکی ڕووناک دەکوژایەوە، هیچ ڕووناکییەکی بەجێ نەدەهێشت، چونکە هەموو تەمەنی خەریکی خوێندنی ئەو حاشیانە بوو کە باسی کتێبەکەی دەکرد کە دەیخوێند، بێ ئەوەی بزانێت سەرچاوەی ئەو کتێبە لەکوێوە هاتووە، یان زۆرجار لە کتێبەش تێ نەدەگەیشت.

ئەو مامۆستایانەی وەک (مامۆستا عەبدولکەریمی مودەڕیس، مەلای پێنجوینی، قزلجی، نۆدشە، مامۆستا شێخ عومەری قەرەداغی، مەلا قادری گەورەی بیارە، مەلا ئیبن ئادەم، مەلا محەمەدی جەلی زادە، مەلای تر) لەم مامۆستا زیرەکانە وێنەیان کەم بوو.

ئەم مامۆستایانە سوودیان لە خوێندنەکەیان وەرگرت بەتایبەتی زۆر زانستی وەک (منطق) لەوەو پێشتر نەبوو، چونکە وەرگێڕابوو، جگە لە مامۆستا ئەبوبەکری مصنف کە کتێبی (وضوح)ی بەجێهێشت، مامۆستا عەبدولکەریمی مودەڕیس تەفسیری باشی کردووە لەسەر قورئانی پیرۆز، ئەو نوسراوانەی لەسەر ئایینی ئیسلام بەجێهێشتووە، مامۆستا سەید عارف ڕوونکردنەوەی زۆر دوور و درێژی نوسیوە لەسەر (وضوح) و چەند مامۆستایەکی تر، کەس هیچی نەنووسی یان شتێکی بەجێ نەهێشت کە کورد یان ئایینی ئیسلام سودی لێوەربگرێت.

بەڵام لەخوا بەزیاد بێت ئێستا زۆر لە زانایانی ئایینی کوردستان، بەتایبەتی مامۆستا گەنجەکان بوون بە پسپۆڕ، زۆریان دکتۆرا یان ماستەریان وەرگرتووە و، زۆرێکیشیان خەریکی خوێندنی باڵان لە دەرەوە، زۆر پەیمانگای ئایینی لەکوردستان کراونەتەوە. زۆر وتاربێژمان هەیە بەجوانی فەرمودەکانی خوا و پێغەمبەرمان بۆ ڕوون دەکەنەوە، هیوادارین ڕۆژ لەدوای ڕۆژ ڕوو بەزیادی بن بۆ خزمەتی ئایینی ئیسلام و نەتەوەکەیان.

**کلیل ئەگەر دەرگای پێ نەکرێتەوە بۆچی باشە؟**

رۆژێک لە حوجرەی فەقێیەکان دەرسی کتێبی (کلنبوی برهان)م لە زانستی (منطق)دا بە فەقێیەک دەوتەوە، لەوکاتەدا شێخ حسێنی بۆسکێن کە پیاوێکی زۆر دەوڵەمەند و زۆر زیرەک و زۆر ژیر بوو، هەرچەندە خوێندەوارییەکی کەمی هەبوو، ئەو رۆژە بەدیدەنی هاتبوو بۆ لای ئیسماعیل ئاغا، هات بۆ لام بۆ حوجرەی فەقێیەکان، منیش ویستم دەست لە دەرسەکە هەڵگرم، ئەو سوێندی خوارد وتی: دەبێت دەرسەکە تەواو بکەیت، منیش دادەنیشم گوێ دەگرم.

کاتێک لە دەرسەکە بومەوە، وتی: مامۆستا ئەگەر پرسیارێک بکەم پێت ناخۆش نییە؟، وتم: زۆرم پێ خۆشە.

وتی: ئەم دەرسە کەڵکی چیە کە ئێوە وا خۆتانی پێوە ماندوو دەکەن، هەروەها عیلمەکانی تر کە پێی دەوترێت دوازدە عیلم؟

وتم: ئێمە بەهۆی ئەم عیلمانەوە دەتوانین لە ئاینی ئیسلام بکۆڵینەوە، لە قورئانی پیرۆز و فەرمودەکانی پێغەمبەر و حوکمی ئەو شتانە بدۆزینەوە کە لە ژیاندا هەیە و لە پاشە رۆژدا پەیدا دەبن، چونکە قورئانی پیرۆز باسی هەموو شتێکی بە کورتی کردووە لەلایەن دروستی و نادروستییەوە.

وتی: وتەکەت ڕاستە، بەڵام ئێوە رۆژێک لە ڕۆژان ئەم عیلمانە بەکاردەهێنن بۆ دۆزینەوەی ئەو شتانە؟ ئەگەر شتی وا هەبێت بۆچی هەر مەلایەک پرسیاری لێ دەکرێت ناتوانێت وەڵام بداتەوە تا پەنا نەبات بۆ یەکێک لە کتێبەکانی فیقهی شافعی.

لە پاشا وتی: مامۆستا تۆش و مامۆستاکانی تریش لە کوردستان لەمەوپێش و لەمەودوا بە درێژایی ساڵ خۆتان ماندوو دەکەن بۆ دروستکردنی کلیلێک کە دەرگایەکی پێ بکەنەوە، کە ئەویش دەرگای قورئانی پیرۆز و فەرموودەکانی پێغەمبەرە (د.خ)، بەڵام بەداخەوە ئەمرن و رۆژێک لە رۆژان ئەو کلیلە بەکارناهێنن، کەوا بوو سودی کلیل چیە ئەگەر دەرگای پێ نەکرێتەوە. بوون و نەبوونی هەروەک یەک وایە ئەگەر بەکارنەهێنرێت.

بەڕاستی ئەو وتەیە کە لە مانگی حوزەیرانی ١٩٤٨ بوو تا ئێستا (١٢-٨-٢٠٠١) هەردەم ئەم وتەیە کە شێخ حسێن بۆسکێن پێی وتم بەو کەم خوێندەوارییەی خۆی لە گوێمدا دەزرنگێتەوە.

بەراوردێک لە نێوان مامۆستایانی ئایینی کوردستان و مجتهدەکانی (فقه)ی ئیسلامیدا

ئەگەر تەماشای ژیانی مامۆستای ئایینی کوردستان و مجتهدە گەورەکانی ئایینی ئیسلام بکەین بۆمان ڕوون دەبێتەوە کە ئەو سەرچاوانەی کە مجتهدەکان (فقه)ی ئیسلامییان لێ دەرهێناون مامۆستا ئایینییە چاکەکانی کوردستان بەدەرس وتویانەتەوە بە

فەقێی زۆر زیرەک، وەک لە کتێبەکانی (أصول الفقه)دا، ئەو زانستانە کە هەردەم یارمەتی مجتهدیان داوە بۆ دەرهێنانی حوکمە شەرعییەکان لە سەرچاوەکانیانەوە، مامۆستای ئایینی کوردستان دەستێکی باڵایان هەبووە تیایاندا، وەک زانستی (عیلمی بلاغە)، (معان وبیان وبدیع ونحو وصرف) و زانستی (منطق) و (أصول الفقه)و (فلسفە) بابەتەکانی تر کە بە وردی لە مەدرەسە ئایینیەکان لە کوردستانی ئێران و عێراق و تورکیا بە دەرس دەوترانەوە و بەحاشییەی وردەکاری لەسەر ئەم زانستانەیان دەنووسی و دەچونە ناو قوڵاییانەوە کە ئەمانە پێیان دەوترێت (العلوم الالیة) واتە (زانستە ئامێرییەکان)، بۆ زیاتر ڕوونکردنەوەی ئەم بەراوردە بە پێویستی دەزانم بە کورتی باسی ئەو سەرچاوانە بکەم کە مجتهدەکان (فقە)ی ئیسلامییان لێ دەرهێناوە، دوای ئەوە باسی ڕابەری ئەو مەزهەبانە بکەم بۆ ئەوەی ڕوونی بکەمەوە کە هەندێ مامۆستای ئایینی باش هەمیشە لە کوردستاندا بوون پایەی زانیارییان هیچ وەخت لەو (مجتهد)انە کەمتر نەبووە.

**سەرچاوەکانی (فقە)ی ئیسلامی**

١. قورئانی پیرۆز: یەکەم سەرچاوەیە کە هەموو حوکمێکی شەرعی لێ وەردەگیرێت، لەو ئایەتانەدا کە باسی ئەو حوکمانەیان کردووە بە ئاشکرایی.

٢. فەرمودەکان و کردەوەکانی پێغەمبەر(د.خ): زۆرجار حوکمی شەرعی بە ئاشکرایی باس نەکراوە لە قورئاندا بەڵام پێغەمبەر (د.خ) یان لە فەرمودەکانیدا باسی کردووە یان بە کردەوە خستویەتییە ڕوو.

ئەم دوو سەرچاوەیە بنچینەی هەموو حوکمێکی شەریعەتی ئیسلامن، سەرچاوەکانی تر هەموویان دێنەوە سەر ئەم دوو سەرچاوەیە.

٣. الاجماع: واتە کۆدەنگی (اتفاق)ی هەموو زانا پێشوەکانی ئیسلام لە یارانی پێغەمبەر و ئەوانەی لە دوای ئەوان هاتوون لە (مجتهد)ەکان.

٤. (القیاس): ئەگەر دوو شت هەبوون وەک یەک وابوون لە هۆی حوکمەکانیاندا، بەڵام یەکێکیان قورئانی پیرۆز یان (حدیث الشریف) باسی کردبوو ئەو حوکمە دەدرێت بەوی تریان، چونکە هەردوولا وەک یەک وان لە هۆی هاتنی ئەم حوکمە، بۆ نمونە: پێغەمبەر (د.خ) فەرمویەتی: (لایرث القاتل)، واتە: ئەگەر میرات گرێک میرات لێ گیراوەکەی خۆی کوشت بێ بەش (محروم) دەکرێت لە میراتەکەی، ئینجا (مجتهد) یان قازی یان مفتی دەتوانێت بڵێت ئەگەر یەکێک وەسیەتیان بۆ کرد وەسیەتکەرەکەی کوشت بێ بەش دەکرێت لەو وەسیەتە، هەروەها ئەگەر یەکێک ماڵێکیان بۆ (وقف) کرد (وقف)کەرەکەی کوشت ئەویش بێ بەش دەکرێت لەو (وقف)ەدا، چونکە هۆی بێ بەشکردنەکە لە میراتدا

لەم دوو نمونەیەشدا دێتە دی.

کە ئەوەش بریتییە لە پاراستنی گیانی مرۆڤی بێتاوان، چونکە ئەگەر میرات گرەکە یان وەسیەت بۆ کراوەکە یان ئەوەی وەقفێکی لەسەر کرابێت بزانێت بەکردەوەی کوشتن بێ بەش دەبێت ئەو کردەوەیە ناکات.

٥-(المصلحة) بەرژەوەندی: مەسڵەحەت لە ئایینی ئیسلامدا بریتییە لە ڕاکێشانی سود و نەفعێک (جلب المصلحة) یان دوورخستنەوەی زیان و زەرەرێک (درء المفسدة)، حوکمەکانی خوا هەمووی بۆ بەدیهاتنی ئەم دوو مەبەستە هاتووە.

من زیاتر لە (٦٠) ساڵە لەگەڵ شەریعەتی ئیسلام دەژیم بە خوێندن و وانەوتنەوە و کتێب دانان و بەراوردکردن لەگەڵ یاسادا، لەم ماوەیەدا بۆم ڕوونبوویەوە هەرشتێک سودی تێدابێت بۆ ئادەمیزاد ئەوە لە ئایینی ئیسلامدا حەڵاڵە ئەگەر ئەو سوود و نەفعە زیانێکی تیادا نەبێت بۆ یەکێکی تر. هەروەها هەر شتێک زەرەر و زیانی تیادابێت بۆ ئادەمیزاد ئەو شتە خوا حەرامی کردووە، ئەگەر ئەو زەرەرە یان ئەو زیانە سودێکی گەورەی تێدا نەبێت بۆ کۆمەڵی ئادەمیزاد، وەک سزای تاوانبار بە حەپس یان بەجۆرێکی تر، زیانی تێدایە بۆ خۆی بۆ خێزانەکەی بۆ گەلەکەی، بەڵام هەموو ئایینەکان و یاساکانی جیهان ئەم سزایەیان پەسەند کردووە و بڕیاریان لەسەر دروست بوونی داوە، چونکە سودێکی گەورەی لێ پەیدا دەبێت ئەویش بریتییە لە پاراستنی گیان و ماڵ و شەرەفی مرۆڤ لەناو کۆمەڵدا، چونکە ئەگەر پرسینەوە و سزا نەبێت بۆ تاوانبارەکان مرۆڤی خراپ ژیان تاڵ دەکەن لە کۆمەڵگەکەیان.

٦-(الاستحسان): خوای گەورە بۆ هەموو شتێک دوو حوکمی داناوە لەسەر ئادەمیزاد، یەکێکیان پێویستە لەسەری ئەنجامی بدات لەکاتێکدا هیچ عوزرێک و تەنگ و چەڵەمەیەکی نەبێت ئەمەش پێی دەوترێت (العزیمة)، حوکمەکەی تریان بۆ ئەوەیە کە پێویستە لەسەر ئادەمیزاد لەکاتێکدا کە عوزرێکی هەبێت یان لە ژیانێکی ئاسودەیی دا نەبوو ئەوا دەتوانێت پاش لاچوونی عوزرەکە ئەنجامی بدات، بۆ نموونە خوای گەورە ڕۆژووی ڕەمەزانی واجبکردووە لەسەر هەموو مرۆڤێکی باڵغ و ژیر، بەڵام ئەگەر کەسێک نەخۆش بێت یان شیر بەمنداڵ بدات یان سەفەر بکات دەتوانێت ڕۆژوو نەگرێت لە ڕەمەزاندا لەو ماوەیەدا کە ئەو عوزرەی هەیە.

ئەنجامدانی حوکمی دووەم لە کاتی عوزردا هەروەک پێی دەوترێت ڕووخسەت، واتە هەڵسان بەم حوکمە لەلای خوا شتێکی چاک و جوانە، هەروەک لەم ئایەتە پیرۆزەدا دەفەرموێ: **(يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آَمَنُوا كُتِبَ عَلَيْكُمُ الصِّيَامُ كَمَا كُتِبَ عَلَى الَّذِينَ مِنْ قَبْلِكُمْ لَعَلَّكُمْ تَتَّقُونَ (١٨٣) أَيَّامًا مَعْدُودَاتٍ فَمَنْ كَانَ مِنْكُمْ مَرِيضًا أَوْ عَلَى سَفَرٍ فَعِدَّةٌ مِنْ أَيَّامٍ أُخَرَ).**

هەروەها خوای گەورە گۆشتی مردوو و بەراز و خوێنی ئادەمیزاد یان ئاژەڵی حەرام کردووە لەسەر مرۆڤ لەکاتێکدا عوزرێکی نەبێت ئەمە پێی دەوترێت (عزیمە)، بەڵام بۆی حەڵاڵ کردووە لەکاتی عوزردا، ئەمە پێی ئەوترێت ڕووخسەت، هەروەک لەم ئایەتەدا فەرموویەتی: **(حُرِّمَتْ عَلَيْكُمُ الْمَيْتَةُ وَالدَّمُ وَلَحْمُ الْخِنْزِيرِ) لە کۆتایی ئەم ئایەتەدا دەفەرموێ: (فَمَنِ اضْطُرَّ فِي مَخْمَصَةٍ غَيْرَ مُتَجَانِفٍ لِإِثْمٍ فَإِنَّ اللَّهَ غَفُورٌ رَحِيمٌ).**

واتە: لە کاتی ئاسودەیی و بێ عوزریدا گۆشتی مردوو و بەراز و خواردنەوەی خوێن حەرامە لەسەر ئادەمیزاد، چونکە تووشی نەخۆشی و دەردەداری دەکات، بەڵام لەکاتێکدا کە گرانی بێت و خواردنی تری دەستنەکەوێت، دروستە ئەمانە بخوات بەمەرجێک ئەم خواردنە لە سنووری پێویستی تێ نەپەڕێت.

لە (فقه)ی ئیسلامیشدا ڕێسا دانراوە: (الضرورات تجيز المحظورات)، واتە: زەرورەت شتی حەرام ڕێگە پێدەدات-بۆ ماوەیەکی کاتی-. ئینجا هەڵسان بەم حوکمە دروستە لەکاتی پێویستیدا پێی دەوترێت (ڕووخسەت)، زاناکانی (أصول الفقه)ی ئیسلامی وتویانە: استحسان: (استثناء بعض الجزئيات من القاعدة الكلية، لما يوجب ذلك). واتە: (استحسان) بریتییە لە حوکمێک کە وەک حوکمی ڕووخسەت وایە بەکاردەهێنرێت لەکاتی عوزر و پێویستیدا، ئەم حوکمە لە جێگای حوکمە ئەسڵییەکەدا دادەنیشێت لەکاتی پێویستی و عوزردا.

٧-(العرف): ئەگەر شتێک لە کردەوە یان وتە زۆرجار بەکارهێنرا لەنێو گەلێکدا یان لەناو هەموو گەلاندا ئەوە پێی ئەوترێت عورف، ئینجا ئەم عورفە ئەگەر دژی ئایینی ئیسلام و یاسا نەبێت (مجتهد) یان قازی یان موفتی ئەتوانێت حوکمی لەسەر بنیات بنێت. وەک ئێستا لە عێراقدا مارەیی ژن نیوەی بە پێشەکی دەدرێت بە ژنەکە نیوەکەی تری لە پاش مردنی مێردەکەی پێ دەدرێت، یان لە پاش تەڵاقدانی ئەگەر تەڵاق درا.

بەڵام ئەگەر عورفەکە دژی ئایین یان یاسا بوو ئەوە دروست نییە حوکمی لەسەر بنیات بنرێت، وەک ئەو قاعیدە فیقهیەی دەڵێت: ( العرف محكم) وەک کڕین و فرۆشتن ناکرێت بەبێ مامەڵە.

وەک سەرقوفڵانە کە ئێستا لە عێراقدا باوە یان دروستکردنی خواردن لە ڕۆژی سێیەمی پرسەدا لەسەر ئەرکی خاوەن مردووەکە، ئەمجۆرە عورفە نابێت پەیڕەوی بکرێت.

٨-(سد الذرائع): ئەگەر شتێک خۆی دروست بوو، بەڵام ئەنجامەکەی نادروست بوو ئەوا خۆشی بە نادروست دادەنرێت و قەدەغە دەکرێت، وەک کەسێک دیارییەک بنێرێت بۆ ئافرەتێک مەبەستی لەم دیارییە ئەوە بێت پەیوەندیەکی ناڕەوای لەگەڵ ببەستێت ئەو دیارییە بە حەرام دادەنرێت و دەبێ قەدەغە بکرێت، هەرچەند دیاری بۆ خۆی شتێکی

**من نالێم خوێندنی فەقێیەتی مزگەوت بێ سوودە، بەڵام جۆری خوێندنەکە و جۆری وانەوتنەوەی وای لێ دەکرد کە سوودێکی زۆری نەبێت لە بابەت ژیان و ئایینەوە.**

زۆر باشە، بەڵام ئەگەر بەکارهێنرا بۆ گەیشتن بە ئامانجی ناڕەوا خۆشی بەناڕەوا لە قەڵەم دەدرێت.

٩- (الاستصحاب): مرۆڤ کە لەدایک دەبێت بێ تاوان و بێ گوناهە و گەردنی ئازادە لە هەموو مافی مرۆڤێکی تر، لەبەرئەوە هەر کاتێک گەورە بوو یەکێک داوایەکی لەسەر تۆمار کرد پێویستە لەسەر قازی یان موفتی بەو جۆرە کە لە دایک بووە تەماشای بکات، نابێت ڕازی بێت بەو داوایە تاوەکو خاوەنەکەی بەتەواوی ساغی نەکاتەوە، سەرچاوەی ئەمەش ئەو قاعدە شەرعیەیە کە دەڵێت: (الاصل فی الانسان براءة ذمته من جمیع الالتزامات المدنیة والجنائیة حتی یثبت خلاف ذلک).

هەر لەسەر ئەم سەرچاوەیە قاعیدەی شەرعی یاسایی کە دەڵێت: (المتهم بريء حتی تثبت إدانته)، واتە: هەموو کەسێک تۆمەتێک بدرێتە پاڵی پێویستە لەسەر قازی بەبێ تاوانی بزانێت تا تۆمەتەکەی ساغ دەکرێتەوە بە بەڵگەی شەرعی و یاسایی.

ئەگەر ژنێک شووی کرد بە پیاوێک لە پاش ماوەیەک داوای کرد لە قازی یان مامۆستای ئایینی مارەی بکات لە پیاوێکی تر پێویستە لەسەر ئەو قازییە یان ئەو مامۆستا ئایینی یە بڕیار بدات کە هێشتا ئەم ژنە پەیوەندی ماوە لەگەڵ مێردە پێشووەکەی هەتا بیسەلمێنێت کە مێردی پێشووی مردووە یان تەڵاقی داوە و عیدەی تەواو بووە.

بەڵگەی قازییەکە و مامۆستا ئایینی یەکە، سەرچاوەکەی (استصحاب)ە، واتە: (استصحاب) ئەوەیە کە هەرشتێک حوکمێکی هەبوو لەوەو پێش دادەنرێت ئەو حوکمە هەر بەرپایە تاوەکو پێچەوانەی ئەوە ڕوون بکرێتەوە بە بەڵگەی شەرعی و ئایینی.

ئینجا ئەم سەرچاوانە کە ئیمامەکانی هەموو مەزهەبەکانی ئیسلام حوکمیان لێ دەرهێناون لەڕێگای (اجتهاد)ەوە، مامۆستا ئایینییەکانی کوردستان بە ساڵەهای ساڵ بەدەرس دەیان وتەوە لە مەدرەسە ئایینییەکاندا، بەڵام ڕۆژێک لە ڕۆژان ئەم سەرچاوانەیان بەکار نەدەهێنا بەوجۆرەی کە ئیمامەکانی مەزهەبەکان بەکاریان هێنا، بەڵکو هەرکەسێک

هەر پرسیارێکی ئایینی لێ بکردایە هەڵمەتیان دەبرد بۆ کتێبێک لە کتێبەکانی مەزهەبی شافعی بۆئەوەی بزانن وەڵامەکەی لەناو ئەم کتێبەدا چۆنە. بەپێی ئەوە ئەوانیش وەڵامیان دەدایەوە بەمەرجێک کە ئەم مامۆستا ئایینی یە هەندێک جار گەلێک زاناتر بووە لە خاوەنی ئەو کتێبە. ئینجا هەر بەم جۆرە زاناکانی ئایینی ئیسلام لە کوردستاندا، هەریەکێک وەک چرایەک وابوو لە ماوەی ژیانیدا کاتێک دەکوژایەوە بەکۆچی دوایی لە پاش خۆی هیچ ڕوناکییەکی بەجێ نەدەهێشت کە ئایینی ئیسلام یان گەلەکەی سوودی لێ وەربگرێت مەگەر لەدوای خۆیان نووسینێکیان بەجێهێشتبێ...

**بەراوردێك لە نێوان خوێندنی زانکۆ و مزگەوت**

دوای ئەوەی خوێندنی زانکۆم دەستپێکرد، پاش ماوەیەک بیرم کردەوە و لەگەڵ خوێندنی مزگەوت بەراوردم کرد دیم جیاوازییەکی زۆر هەیە لە نێوان ئەم دوو جۆرە خوێندنەدا.

لەم کۆلێجی یاسایەدا بە ماوەی (٤) ساڵ (٤٠) بابەتی یاسام خوێند، کە هەریەکێک باسی جۆرێکی ژیان دەکات، مرۆڤ لە هەموو جۆرە ژیانێک شارەزا دەکات.

من ناڵێم خوێندنی فەقێیەتی مزگەوت بێ سوودە، بەڵام جۆری خوێندنەکە و جۆری وانەوتنەوەی وای لێ دەکرد کە سوودێکی زۆری نەبێت لە بابەت ژیان و ئایینەوە، چونکە هەر مەلایەک بەپێی پلەی زانیاری خۆی قوتابخانەیەکی هەبوو، بەدرێژایی ڕۆژ وانەی بەدوو یان چوار یان شەش فەقێ دەوتەوە لەوە زیاتر نەبوو، هەریەکە بە جیاواز دوو سەعات لەگەڵیان خەریک دەبوو، تا ئێوارە خۆی ماندوو دەکرد، وەرگێڕانی کتێبەکەی دەکرد لە عەرەبییەوە بۆ کوردی، فێری وتەی خاوەن کتێبەکەی دەکردن، بیری لەوە نەدەکردەوە ئەو قسانە ڕاستن یان هەندێکیان هەڵەن، چونکە ئەم نوسراوانە هەمووی بە (اجتهاد) دانراون، هەموو موجتەهیدێک وەک ڕاستی هەیە هەڵەشی هەیە، مەلای وا هەبوو ئەگەر کتێبەکەیان لێ بگۆڕیایە لە هەمان کتێب دانەیەکی تریان بدایەتێ نەیدەزانی وانەکەی تیا بڵێتەوە، چونکە کتێبەکەی خۆی وەک خۆیان دەڵێن خۆش کردووە بە سەرو بۆرو ژێر و نیشانەکانی تر، ئەگەر وشەکەی (مبتدأ) بوایە لەژێریدا دەینووسی (م)، ئەگەر (خبر) بوایە لە ژێریدا دەینووسی (خ)، واتە مامۆستا بە درێژایی ساڵ کتێبی دەوتەوە، ئەو بیروڕایەی کە لەناو کتێبەکەدایە نە خۆی فێری دەبوو نە فەقێیەکەی، مەگەر مەلایەکی زۆر چاک بوایە، بۆ ماوەیەکی زۆر دەرسی بوتایەتەوە. ئەم جۆرە خوێندنە تەنها سوودی ئەوەیە کە بیروڕای مرۆڤی تیژدەکردەوە و فێری وردەکاری دەکرد، ئەم جۆرە سودەش مرۆڤ هەستی پێ ناکات تا نەچێتە ناو خوێندنی زانکۆوە.

بەڕاستی من سوودم زۆر لێوەرگرت لە خوێندنی یاسادا، بەڵام ئەگەر هەر مەلا بومایە

تا ئێستایش هیچ سودێکم لە خوێندنەکەم و وانەوتنەوەکەم وەرنەدەگرت، چونکە من بۆ خۆم (جمع الجوامع)م لای باشترین مەلا خوێندووە، هەشت جار لەلاپەڕەی یەکەم تا دوالاپەڕە بەدەرس وتمەوە، کەچی فێری زانستی (أصول الفقه) نەبووم، تا بۆخۆم چووم (اصول الفقه)ی هەشت مەزهەبم خوێندەوە و لەگەڵ یاسادا بەراوردم کرد، توانیم ناوەڕۆکی هەموویان کۆبکەمەوە لە کتێبێکدا کە ناوم نا (اصول الفقه الاسلامی فی نسیجة الجدید).

داخی زۆر لە دڵمدایە لە بابەت خوێندنی مزگەوتەوە، چونکە باوەڕ ناکەم لە چەرخی بیستەمدا هیچ ڕۆڵەیەکی کورد هێندەی من ناخۆشی و ماندووبوونی دیبێت لە ڕێگای ئەم خوێندنەدا -هەروەک لە بەشی یەکەمی ژیاننامەکەمدا باسم کرد-، ئەگەر هەر لە مەلایەتی بمامایەتەوە هیچ سودێکم نەدەبوو بۆ ئایینی ئیسلام و بۆ کورد و کوردستان، چونکە هەر دوای قسەی ئەم و ئەو ئەکەوتم، خۆم هیچ بیروڕایەکم نەدەبوو، هیچ کاتێک باوەڕم بە خۆم نەدەبوو کە وتەیەک یان بیروڕایەک بخەمە سەر لاپەڕەی مێژوو، بۆ موسڵمانەکان و نەتەوەکەم سوودی هەبێت.

**نرخی کات لە ژیاندا**

گرنگترین شتێک کە مرۆڤ دەسەڵاتی هەبێت بەسەریدا بریتییە لە کات، پێشینان وتوویانە: (الوقت کالسیف ان لم تقطعه یقطعک)، واتە: کات وەک شمشێرێکی تیژە ئەگەر تۆ نەیبڕی ئەو تۆ دەبڕێت. لەکاتی خوێندنەکەمدا لەسەر ئەم بنچینەیە بناغەی ژیانم دانا، لە ماوەی ئەو چوارساڵەدا لە کۆلێجی یاسا بووم و، ئیمامیش بووم لە سوپا کە بەپلەی ئەفسەر دادەنرێت، هەموو ڕۆژێک لە کاتژمێر حەوتی بەیانییەوە تا دووی پاش نیوەڕۆ لە فەرمانگە بووم، ئیش و کاری فەرمانگەم تەواو دەکرد و لە پاشاندا دەچوومە شوێنێکی کەنار کە کەس نەمبینێت، ئەو وانانەی کە ڕۆژی پێشوو خوێندبووم بە مانا لەبەرم دەکرد نەک بە (عبارة الفاظ)، چونکە شت لەبەرکردن بە مانا باشتر مرۆڤ لە بابەتەکە دەگات و درەنگتریش لە بیری دەچێتەوە، هەر بەم جۆرە خۆم فێرکرد کە بیروباوەڕی یاسایی تێبگەم، نەک خۆم فێری کتێبی مامۆستاکان بکەم، چونکە ئەگەر لەسەر کتێب بڕۆم خوێندنەکەی کۆلێجم هیچ جیاوازییەکی لەگەڵ خوێندنی حوجرە نابێت، بەدرێژایی ساڵ دەبێت هەر فێری کتێب ببم و، دووربم لە ڕاستو چەوتی ئەم کتێبانەوە، بیروباوەڕم وابێت کە هەرچی نوسراوە هەمووی ڕاستە، باوەڕم بەخۆم نەبێت کە منیش بیروباوەڕێکی تایبەتیم هەبێت لەم بابەتەدا.

هەرچیم دەخوێندەوە لە کتێبەکانی یاسا لە هەموو جۆرە بابەتێک پێشەکی لە دڵی خۆمدا بڕیارم دەدا کە ئەمە ڕاست نییە، ئینجا دوایی دەستم دەکرد بەلێکۆڵینەوەی، تا چاک و خراپەی بکەوێتە بەرچاوم بۆ ئەوەی چاکەکەی بگرم و خراپەکەی لە خۆم دوور بخەمەوە.

**ئامۆژگاریی و ڕاسپاردەی بۆ زانایانی ئایینی**

لەو ماوەی عومرمە ٣٥ ساڵ لە جامیعەکانی عێراق مقارنەم کردووە لە بەینی شەریعەتی ئیسلام و قانوونەکانی دوەلی عالەما، قەناعەتم پەیاکرد بەبێ تەعەسوب بە قەناعەتێکی علمی یەقینی کە بەدیل بۆ شەریعەتی ئیسلام نییە، بەدیل بۆ قورئانی کەریم نییە، جا لەبەرئەوە داوا ئەکەم لە مامۆستاکان تەمەنی خۆیان بەزایەع نەدەن.

دوو وەسیەتی گەورەی گەورەکانی ئیسلام ئەگەیەنم بەو مامۆستایانی ئایینیە، یەکەمیان فەرموودەی حەزرەتی عەلی (خوا لێی ڕازی بێت)، ئەفەرموێ: (انظر الى ما قيل ولا تنظر الى من قال) هەرچیەکت خوێندەوە، هەرچیەکت بیست، تەماشای قسەکە بکە، تەماشای ساحێبی قسەکە مەکە، غەیری خوا و پێغەمبەر نەبێ، چونکە ئەگەر تەماشای ساحێبەکەیان بکەی غەڵەت بێ یان صەحیح بێ، تەسلیم ئەبی، بەڵام ئەگەر تەماشای قسەکەت کرد، شی ئەکەیتەوە لە ناحیەی مەنتیق و عەقڵ و فەلسەفەوە، ئەگەر زانیت شتێکی ڕاستە دوای ئەکەوی، ئەگەر زانیت شتێکی غەڵەتە پاڵی پێوە ئەنێیت.

وەسیەتی دووەم، وەسیەتی فەیلەسوفی ئیسلامی گەورە، ئیمامی غەزالی یە، ئەفەرموێ: هەموو شتێک غەیری قورئان و سوننەتی پێغەمبەر، بەشک وەربگرە، دایبنێ ئەم شتە ڕاست نیە، جا هەرکەسێک هەیە، ئەفەرموێ: (من لم يشك لم ينظر) هەرکەس نەکەوێتە شکەوە لە شتێکدا کە ئەیخوێنێتەوە، نەزەر ناکا، مەبەستی تەفکیری دەماغە، (ومن لم ينظر لم يبصر) ئەوەش کە نەزەر نەکا بەصیرەت بەکار ناهێنێ، بەصیرەتی دەماغ، (ومن لم يبصر بقى فى العمى والظلال) ئەو کەسەش کە بەسیرەت بەکارنەهێنێ لە نەزانیدا ئەژی.

من لەپاش ئەو هەموو عومرە، ئەو هەموو تەدریسە، پاش ئەو هەموو تەئلیفە، کە مەصدەری حوکمی شەریعەتی ئیسلام سێ شتە، مەصدەری مونشئ، ئەو مەصدەرەی کە حوکمەکەی دروست کردووە، ئەوە تەنها قورئانە، خوا خۆی ئەفەرموێ (ان الحكم الا لله)، کەواتە حوکمی بەشەری تەنها خوا دایئەنێ، سوڵتەی بە هیچ بەشەرێ نەداوە کە بێت حوکمی شەرعی دابنێ، موجد و مونشئی حوکمی شەرعی تەنها قورئانە، تەنها خوایە.

وەزیفەی پێغەمبەر چیە؟ خوا دوو وەزیفەی داوەتێ، یەکەمیان وەزیفەی بەیان، بەیانی قورئان: **(وَأَنْزَلْنَا إِلَيْكَ الذِّكْرَ لِتُبَيِّنَ لِلنَّاسِ مَا نُزِّلَ إِلَيْهِمْ)** النحل: ٤٤.

دووەم وەزیفەی تەبلیغە، (وما على الرسول الا البلاغ).

کەوابوو لەگەڵ ئەو هەموو عەزەمەت و گەورەییە، سوڵتەی ئەوەی نەدراوەتێ حوکم دروست بکا.

مەصدەری سێیەم مەصدەری کاشیفە، کە ئیجتیهاداتی فوقەها و موجتەهیدینە. وەزیفەی ئەم مەصدەرە کەشفی حوکمەکەیە، ئەگەر حوکمەکەی خوای دۆزییەوە ئەوە موصیبە، ئەگەر نەیدۆزییەوە ئەو موختیئە.

> **هەر موفتییەك یا قازییەك ئەگەر هاتوو ڕەئی لە ئارائی موجتەهیدین هێنا دەلیلی قورئان و سوننەتی پێغەمبەری لەگەڵ نەبوو، ئەوە گوناهبارە فتوا بدا بەو کتێبە یان بەو مەزهەبە.**

لەبەرئەوە، مامۆستاکان، هەمووتان گوناهبارن کە قسەی یەکێک نەقڵ ئەکەن بەبێ ئەوەی کە دەلیلەکەی بزانیت، ئەمە زۆر هەڵەیەکی گەورەیە، چونکە ئەوانە ناتوانن حوکم دروست بکەن، ئەوانە کەشفی حوکم ئەکەن، کەوابوو هەر موفتییەک یا قازییەک ئەگەر هاتوو ڕەئی لە ئارائی موجتەهیدین هێنا دەلیلی قورئان و سوننەتی پێغەمبەری لەگەڵ نەبوو، ئەوە گوناهبارە فتوا بدا بەو کتێبە یان بەو مەزهەبە.

**دەرئەنجامی ئەزموونی ژیانی:**

١- پەشیمان نیم لەو (١٢) ساڵەی خوێندن کە بە ماندووبوون و برسێتی و ڕووتی و دووره وڵاتی و گەڕانی دێ و شاران تەواوم کرد، هەرچەندە پێم وابوو کە هیچ سوودم لە خوێندنەکە نەبینیوە، بەڵام بۆ دواڕۆژ لە زانکۆدا سوودم لێ وەرگرت، ئەو بابەتانەی کە لە حوجرەکان دەخوێنران، ئاستی بیرکردنەوەی مرۆڤ فراوان دەکەن، کە بیر بکاتەوە و بەدوای زانیاری زیاتردا بگەڕێت.

٢- ساڵی ١٩٦٠ لە کۆلیجی یاسا لە زانکۆی بەغدا وەرگیرام، مامۆستاکان کە بابەتێکی یاساییان ڕوون دەکردەوە، بۆ من تێگەیشتنی زۆر ئاسان بوو، بەپێچەوانەی ئەو قوتابیانەی لەگەڵمدا بوون کە نەیاندەتوانی بەباشی بابەتەکە بهێننە بەرچاوی خۆیان، ئەو توانایەی من بەهۆی خوێندنی مزگەوتەوە بوو، کە دواتریش توانیم سێ ماستەر و دوو دکتۆرا بەدەست بهێنم و زیاتر لە (٦٠) دانراوم هەیە و هێشتا چەند دانراوێکم هەیە کە بڵاو نەکراوەتەوە، زۆری دانراوەکان بەراوردە لە نێوان فقهی ئیسلامی و یاسادا.

٣- ئەو خوێندنەی کە لە مزگەوت و دواتریش ئەوەی کە لە زانکۆ خوێندم وایلێکردم کە زۆر شتی ورد هەبوو لە یاسادا یان لە باسکردنی حوکمە شەرعییەکاندا بیان بینم، کردم بەو دانراوانەی کە ئێستا لە کۆلیژەکانی یاسادا دەخوێنرێن:

له قۆناغی یەکەمدا: (المدخل لدراسة الشريعة الاسلامية).

قۆناغی دووەم: (احكام الزواج والطلاق).

قۆناغی سێهەم: (أحكام الميراث والوصية وحق الانتقال فى الفقه الاسلامي).

قۆناغی چوارەم: (أصول الفقه الاسلامى فى نسيجه الجديد).

له قۆناغی ماستەردا: (موانع المسؤلية الجنائية فى الشريعة الاسلامية و التشريعات الجزائية العربية).

له قۆناغی دکتۆرادا: (الالتزامات فى الشريعة الاسلامية و التشريعات المدنية العربية).

دانراوی (أصول الفقه الاسلامى فى نسيجه الجديد) له زانکۆکانی وڵاتی ئوردن و یەمەن و ئەندەنوسیا و ئێران دەخوێندرێت.

ئەمانە هەمووی بەهۆی وردەکاری قۆناغی خوێندنی مزگەوتەوە بوو.

٤- قورئانی پیرۆز له (٤٩) ئایەتدا فەرمانی بەوە داوە کە ژیری (عەقڵ) بەکاربهێنرێت، ئەگەر میللەتی عەرەب بەتایبەت و موسڵمانان بەگشتی دژی ژیری نەبووایەین، ئێستا لەجێگەی ئەمریکا ئەبوون له داگیرکردنی بۆشایی ئاسماندا.

٥- من کە زیاتر له (٦٠) ساڵە لەگەڵ شەریعەتی ئیسلامدا دەژیم، زیاتر له (٤٠) ساڵە لەگەڵ یاسای هەموو وڵاتان دەژیم، زیاتر له (٢٥) ساڵە بەراورد دەکەم له نێوان یاسا و شەریعەتی ئیسلامدا، ئێستاش بیروباوەڕێکی جوان و ڕوون نەبووە له یاساوە وەرمگرتبێت، کە جوانتر یان ڕوونتر بێت لەوەی کە شەریعەتی ئیسلام باسی کردووە.

ئەوەی باوەڕ ناکات ئەتوانێ خۆی بەراوردی بکات ئەزانێت نە (مبالغە)ی تێدایە و نە (تعصب).

٦- «له ماوەی ژیانمدا له نێوان بەراوردکردنی ئایینی ئیسلام و هەموو یاسای دەوڵەتان و بیروباوەڕی جیاواز و ئایینەکانی تر زیاتر له چل ساڵ، تێکەڵاویم لەگەڵ خەڵکی جیاوازی جۆر بەجۆر، ئەم بیروباوەڕەم بۆ دروست بوو، شتێکم نەدی ئیسلام بڵێت مەیکە ژیری بڵێت بیکە، هەروەها بەپێچەوانەی ئەوەوە شتێکم نەدی ئیسلام بڵێت بیکە ژیری بڵێت مەیکە».

**دەرئەنجام: بەخوێندنەوەی ئەم دێڕانە لە کتێبی «کاروانی ژیانم» دەگەینە ئەم دەرئەنجامانە:**

١- قوتابی زانستە شەرعییەکان دڵسۆزییەکی زۆریان هەبووە و هەیە بۆ ئەو زانستانەی دەیخوێنن و ماندووبونی زۆریان لەپێناودا چەشتووە.

٢- ئەو زانستانەی قوتابی زانستە شەرعییەکان دەیخوێنێت تەنها تایبەت نییە بە ژیانی دونیای مرۆڤەکانەوە، بەڵکو پەیوەندی بە قیامەتیشیانەوە هەیە.

٣- کورد خاوەنی چەندەها زانای ئایینی پایەبەرز بووە کە مەدرسەی گەورەیان هەبووە و وانەیان بەفەقێ وتووەتەوە و کەم گوندی کوردستان هەبووە فەقێی تێدا نەبێت.

٤- خەڵکی کوردستان فەقێ و قوتابی زانستە شەرعییەکانیان خۆشویستووە و خزمەتیان کردوون و ڕێزی تایبەتیان لێ گرتوون.

٥- ڕێزگرتنی تایبەت هەبووە لەنێو قوتابی و مامۆستادا لە خوێندنی زانستە شەرعییەکاندا.

٦-دکتۆر مستەفا زەڵمی ڕەخنەکانی لە ڕوانگەی دڵسۆزییەوەیەتی بۆ ئایینی ئیسلام و قوتابخانە و مەدرسە شەرعییەکان.

٧- بەداخەوە زۆربەی زانایانی ئایینی ئەو زانستەی خوێندبوویان تەنها بۆ فێرکردنی نەوەی دوای خۆیان بەکاریان هێناوە و کەمتر توانیویان لە دەرهێنانی حوکمە شەرعییەکاندا لێی سوودمەند بن.

٨- ئەو مامۆستایانەی زانستە شەرعییەکانیان خوێندووە لە هەر بوارێکی دیکەدا کاریان کردبێت توانیوویانە بەهۆی ئەو زانستە شەرعییانەوە قوڵتر ڕۆبچنە نێو بابەتەکانەوە و داهێنان بکەن، نموونەش لێهاتوویی زەڵمی لە بواری یاسادا کە باڵادەستبوونی بۆ ئەو زانستە شەرعییانە دەگێڕێتەوە کە لە حوجرەی مزگەوتدا خوێندوویەتی، بەهەمان شێوە دەتوانین ئاماژە بە مامۆستا مەلا عەبدولکەریمی مودەڕیس بکەین کە بەهۆی ئەو زانستە شەرعییانەی خوێندوویەتی توانیوویەتی بە جوانی لێکدانەوە بۆ شیعری شاعیرانی کلاسیکی کوردی بکات.



پ.ی.د.حەسەن محەمەد پشدەری

# ڕۆڵی حوجرەکانی کوردستان
## لە ڕابردوودا لە پاراستن و پێشخستنی ئەدەب و زمان و زانستدا

ئاشکرایە یەکێک لەو سەروەتە کلتووریی و مێژووییە هەرە مەزنانەی کە پێویستە هەردەم گەلەکەمان شانازی پێوە بکات حوجرە و مەدرەسە ئەهلییەکانە، کە لە ڕابردوودا تاکە سەرچاوەی زانست و زانیاری بوون و توانیویانە بە درێژایی مێژوو پارێزگاری لە کیان و کلتوور و زمان و زانست و زانیاریی و خوێندەواری خەڵکی ئەم نیشتیمانە بکەن.

لە ڕابردوودا لە پەنا زۆرێک لە مزگەوتەکانی کوردستاندا یان لە ناو حەوشەی مزگەوتدا شوێنێک جودا دەکرایەوە و وەک سەرچاوەیەکی خوێندن و خویندەواری دەبووە قوتابخانەیەکی خنجیلانە بۆ ئەو ناوچەیە، کۆمەڵێک یاسا و ڕیسای تایبەت بە خۆی هەبوو، جیاواز لەو یاسایانەی کە ئێستا لە قوتابخانەکان دەیانبینین، وەک ئەوەی قوتابییەکان شەو و ڕۆژ لەو جێگایەدا دەمانەوە و قوتابییەکان مەرج نەبوو خەڵکی ئەو ناوچەیە بن و خوێندن هەمووی لەبەرکردن و پرسینەوەی لەسەربوو، یاساکانی لەبەرکردن و ڕێزگرتن زۆر توندبوون، قۆناغەکانی خوێندنی قوتابی بەو کتێبانە دیاری دەکرا کە فەقێ دەیخوێند، بەشێوەیەکی گشتی قوتابییەکان دوو قۆناغی سەرەکییان هەبوو (سوختە، موستەعید)، لە قۆناغی یەکەمدا قوتابی فێری خوێندن و نوسین و زمانی عەرەبی و زانستەکانی تایبەت بە یاساکانی زمانی عەرەبی وەک (النحو، الصرف) دەبوو، کورتەیەکیش لە زانستی ڕەوانبێژی فێر دەکرا.

پاشان کە قوتابی دەگەیشتە قۆناغی (موستەعید) ی سەرجەم زانستەکانی دیکەی خوێندنی ئەو کاتەی پێ دەگووترا، وەک: لۆژیک و تەفسیر و فەرموودە و زانستی کەلام و فیقە و ئوصولی فیقە و فەلسەفە و فەلەکناسی و حیکمەت و هەندەسە و بیرکاری.

زانستی ڕەوانبێژیش یەکێک بوو لەو زانستانەی زۆر بە دورو درێژی دەخوێنراو هەوڵ دەدرا یاساکانی بەکاربهێنرێتەوە لە وتار و شیعر و پەخشان و موناسەبەتە کۆمەڵایەتییەکاندا. هەروەها زانستی عەروزی شیعری عەرەبیش لە هەندێ حوجرە دێرینەکان گرنگی زۆری پێدراوە بۆئەوەی قوتابی بتوانێت ئەگەر شیعر بنووسێت یاساکانی ڕەچاو بکات، یان بتوانێت ڕەخنە بگرێ لە شیعری شاعیران یان لە کاتی مونازەرە بەکاری بهێنێت و ڕەخنەی پێ لە بەرامبەرەکەی بگرێت.

سێشەممە و جومعان فەقێی حوجرەکان هەوڵیان دەدا لە حوجرەیەک کۆببنەوە ئیتر ئەو زانستانەی خوێندوویانە یەکتریان پێ تاقی دەکردەوە و، زۆرتر شەڕە شیعریان کردووە، ئەوەندە گرنگییان بە شیعری شاعیران دەدا کە جاری وا هەبوو یاسای شەڕە شیعرەکان بەشێوەیەک بوو دەبوایە قافیەی هەر شیعرێک وترابوایە تاقمی بەرامبەرەکە بەهەمان قافیە شیعرێک ئامادە بکات، ئەگەر نەیتوانیبوایە شیعرێک بەهەمان قافیە بهێنێ ئەوا دەیدۆڕاند، جاری وا هەبووە تاوەکو نزیک بەیانی ئەو جۆرە مونازەرانە بەردەوامییان بووە.

سەید مستەفا مەحمودییان لە کتێبی فەقێ و فەقێیەتی لە کوردستان دەڵێت: هەموو شاعیرە کۆنەکان و بەشێکی هەرە زۆری شاعیرە لاو و تازەکانمان لە حوجرە سەریان هەڵداوە، کە هەندێکیان بەچوار زمانی کوردی عەرەبی و فارسی و تورکی شیعریان داناوە. برێک لە فەقێکان ئەگەر هەستێکی زۆر بەهێزیشیان نەبووبێت یان هەر نەیانویستبێت

ببنه شاعیر لانی کەم هێندێک هۆنراوەی مەزهەبی و سیاسی و کۆمەڵایەتی، یان جۆری دیکەیان هەیە و، هەر نەبێت ژیواری نالەباری خۆیان بە هۆنراوە نوسیوە و، بەم جۆرە دەردی دڵیان کردووە و کەوتوونەتە سکاڵا لە ژیانی پڕ ژانیان. جاری وا هەبووە شیعر هەڵبەستن و شیعر وتن لە حوجرەدا وای پەرەسەندووە کە لەڕووی شۆخییەوە ئەو تاکە شیعرەی شێخ ڕەزای تاڵبانییان بۆ یەکتر خۆێندووەتەوە کە دەڵێ: ((چونکە شاعیر زۆر بووە لەم عەسرەدا بۆتە حەشری نێرەکەر لەم حوجرەدا))(١)

حوجرەکانی کوردستان هەر لە دێر زەمانەوە بوونەتە قوتابخانەی ئەدەب و شیعر و زمان و هەمیشە مایەی شانازی گەلەکەمان بوون، د.مارف خەزنەدار کاتێک باسی ئامانجەکانی حوجرە و مزگەوت دەکات دەڵێت: هەندێک لەو مەلا خوێندەوارانەی لە حوجرەکان پێگەیشتوون خوێندەوارییی خۆیان کە مەلایانە بووە لەگەڵ زمانی کوردی گونجاندووە لەڕووی پراکتیکییەوە، واتە شیعر نوسینیان بە زمانی کوردی هێناوەتە ناوەوە با بەشی زۆریش لە پلەی داهێنان نەبووبێ لەڕووی هونەریی و ئیستاتیکییەوە، بەڵام بەرهەمی وایان بووە کە مێژووی ئەدەبی کوردی شانازییان پێوە بکات.

بەشێکیش لەو مەلایانە لەگەڵ ئەوەی پلەی زانستی ئایینییان لە لوتکە بووە و لەڕیزی هەرە خوێندەوارە گەورەکان بوون، بەڵام هەستی نەتەوایەتی و سۆزی نیشتیمانپەروەری بووەتە هۆی ئەوەی دەرگای گێتییەکی زانیاریی و داهێنانێکی تر بکەنەوە. زمانی نەتەوە دێننە پێشەوە نەوەکو بۆ مەبەستی زمانەکە خۆی، بەڵکو بۆ دیاریکردنی چارەنووسی نەتەوەکە، کە بە پێشخستنی زمانەوە بەستراوە.

مێژووی ئەدەبی کوردی گەلێ مەلای گەورە دەور دەکاتەوە و ناویان لەناو لاپەڕە زێڕینەکانیدا تۆمار دەکا وەک: شاعیری گەورە و هەڵکەوتوو و داهێنەر لەوانە: مەلا پەرێشان، مەلای جەزیری، ئەحمەدی خانی، نالی، حاجی قادر، شێخ ڕەزا و مەحوی هی تریش..(٢)

هەروەها کەریم شارەزا دەڵێت: لە کۆندا زۆربەی مزگەوتەکان حوجرەیان هەبووە بۆ پێگەیاندنی فەقێ و مەلا کە نموونەی ڕۆشنبیری ئەوسا بوون و زۆرینەی ئەو فەقێیانەش یان شاعیر یان شیعر دۆست و ئەدەب پەروەر بوون، بۆیە هەردەم گۆشەی حوجرەکانیان کردووە بە گۆشەی کۆڕ بەستنی ئەدەبی و شەڕە شیعر و لێکۆڵینەوە لە شیعری شاعیرە گەورەکانی کورد، تەنها شاری کۆیە هەر لە کۆنەوە نزیکەی ٥٠ حوجرەی تیادا بووە کە مەڵبەندی ئەدەب و زانست و زانیاری بووە، لەوێوە دەیان کەڵەشاعیری گەورەی وەک قاصید وحاجی قادری کۆیی و کەیفی و حاجی مەلا عەبدوڵڵای جەلی زادە و شێخ ڕەزای تاڵەبانی و صافی و مەلای گەورە و مەلا عاصی و..هتد پێگەیشتوون (٣)

مامۆستا محەممەد ئەحمەدیان دەڵێت: هەربۆیە مێژووی نەتەوەی کورد دەبێ

شانازی بە حوجرەوە بکات، شانازی بەو کەسایەتیانەوە بکات لە حوجرە هاتوونەتە دەر، لاپەڕەی گەش و درەوشاوەیان لە مێژووی ئایینی و نەتەوایەتی زیاد کردووە..
(٤) لە درێژەدا دەڵێت: ئەگەر بەنیازی هەڵبەستنی مێژووی پڕ لە شانازی خۆمان نەگۆڕین کۆنترین بەڵگەی نوسراومان هەر ئەو شیعرە کوردیانەن کە مەلای وەک خانی و بێسارانی و جەزیری لە سوچی حوجرە و لەکاتی حەسانەوە و بێکاریدا دایانناون و بە ڕێنوسی عەرەبی و فارسی نوسیویاننەوە، ئەو مەلایانە پێشەنگ و ڕەچە شکێنی زمان و ئەدەب بوون، بناغەداری ئەدەبی نوسراومان مەلا بوون، گەورەترین شاعیرانمان یا مەلا بوون یان پەروەردەی قوتابخانەکانی ئایینی بوون، وەک نالی سالم مەولەوی حاجی قادر وەفایی حەریق، مەحوی. (٥)

لەڕاستیدا ئەو شاعیرە مەزنانەی کە لە حوجرەکانی وڵاتی کوردەواری دەرچوون هیچییان کەمتر نەبووە لە شاعیرە گەورەکانی فارس و عەرەب و تورک، بەڵام بەداخەوە نەبوونی کیان و دەوڵەتێکی ئازاد ڕەنج و ناو و ناوبانگی ئەوانی کپ کردووە، وەک محەممەدی مەلا کەریم دەڵێت: لە شیعری کوردیدا شیعری باسی ئازایی و قارەمانی و سیلاح شۆڕی (مەلحەمە)ی وای کوردان هەیە ئەگەر گوێی بدرایەتێ و چاودێری بکرایە هیچی لە (شاهنامەی فیردەوسی) کەمتر نەئەبوو، کە نەتەوەی فارس ناوی لێناوە(قورئانی فارسی) و لە ڕیزی نوسراوە بەرزەکانی گێتیدا دانراوە.

حاجی قادر دەڵێت:

**بەیتی (دمدم)کـە قەدری نازانن　　　پاکی سـیحری حەڵاڵی کوردانن**
**وەکو شانامە گـەر بنوسـرایە　　　لێت موعەییەن دەبوو چ وەستایە**

یان ئەڵێت:

**نییە وەک بەیتی (حەتەم) لە دەعوادا　　　نییە فیردەوسی سەد کلک بادا(٦).**

هەروەها کاتێ کە دەچیتە خزمەت ئەحمەدی خانی بەزەییت پیایدا دێتەوە کاتێک توانای ئەدەبی و زانستی خۆی بینیوە و توانای زانا و شاعیرەکانی نەتەوەکانی دیکەشی بینیوە و بەراورد نەکراون بەیەک لەڕووی بابەتییەوە، بەڵام لەبەرئەوەی ئەوان دەوڵەتێکی گەورەیان لەپشتەوەیە و نوسراوەکانیان بە بایەخەوە وەردەگیرێن و بڵاودەکرێنەوە و خزمەت دەکرێن و ئەویش بەو هەموو زانستەوە خۆی و شیعر و نوسراوەکانی بێناز کەوتوونەتەوە و بێ خزمەتن، خانی بەم پارچە شیعرانەی تەعبیر لەو هەستە ناخۆشەی دەکات و دەڵێت:

**ئەو شاعیرە بەرزانەی لە حوجرەکانی کوردستان دەرچوون هەندێکیان ئەوەندە بەهرەمەند بوون بەهەموو زمانەکانی ناوچەکە شیعر و پەخشانیان نووسیوە.**

**کورد نە هێندە گێلو گێژ و کاسن　　داخم ئەو بێکەسن کەساسن**
**ژیر و بەدڵن گــەلێک دەزانن　　بێخێوییە بــێ سەر و زمانن**
**بۆ مەش کە هەبا خێو و سەردار　　بەخشندە و ژیر و زیت وشیار**
**ژیــری و هونەری بەدڵ کڕیبا　　ژەنگی لـــە دڵی هەژار سڕیبا**
**مــن ئێستە لە کۆڕی وێژەوانان　　ئالام دەشەکا لە عاسمانان(٧)**

هەروەها ئەو شاعیرە مەزنانەی کە دەرچووی حوجرە و قوتابخانە ئاینییەکان بوون زۆر شانازییان بەوەوە کردووە کە کورد بوون و هەمیشە هەوڵی ئەوەیان داوە کە زمانی کوردی وەک زمانێکی ڕەسەنی ناوچەکە بپارێزن و شانبەشانی گەلانی دیکە هەموو فاکتەرەکانی بەرەوپێشچوون و مانەوەیان بۆ ڕێکخستووە لەوانە شیعر و فەرهەنگ و نووسین و ڕێزمان، یەکێک لەو شاعیرە مەزنانەی شانازی خۆی تۆمار دەکات نالی مەزنە، ئەوەتا کاتێک ڕەخنەیان لێ گرتووە لەسەر نووسینی شیعر بە کوردی دەڵێت:

**تەبعی شەککەر باری من کوردی ئەگەر ئینشا ئەکا**
**ئیمتیـحانی خۆیە مەقســودی لە عەمدەن وا ئەکا**
**با لە میدانی فەســاحەتدا بە میسلی شەهســـوار**
**بێ تەئەممول بەم هەموو نەوعە زبانی وا ئەکـا**
**کەس بەئەلفازم نەڵێ خۆ کوردییە خۆ کوردییـە**
**هەر کەسێ نادان نەبێ خۆی تابیعی مەعنا ئەکـا**

ئەو شاعیرە بەرزانەی لە حوجرەکانی کوردستان دەرچوون هەندێکیان ئەوەندە بەهرەمەند بوون بەهەموو زمانەکانی ناوچەکە شیعر و پەخشانیان نووسیوە و شانازیشیان پێوە کردووە، زیاتریش مەبەستییان ئەوەبووە لەڕێگەی شیعرەکانیانەوە ئەوە بە گەلانی ناوچەکە بڵێن کە گەلی کورد و زمانەکەی هاوتەریبە لەگەڵ زمانەکانی دیکە. نالی دەڵێت:

**فارس و کورد و عەرەب هەرسێم بە دەفتەر گرتووە**
**نالی ئەمــڕۆ حاکمی ســێ موڵکە دیوانی هەیـــــە**

ئەو مەلا و ئەدەبدۆستانەش کە دنیای مەعریفەتی ئەدەبییان لە لوتکەدا بووە هەمیشە لە هەوڵی ئەوەدا بوون سەربەخۆیی زمانی کوردی لە هەموو ڕوویێکەوە بپارێزن، وانیشان نەدەن کە ئەم زمانە پاشکۆی زمانێکی تری ناوچەکەیە، چونکە ئەو هەستە ڕەگەزپەرستی و پاوانخوازییە لە ناخی هەندێک لە خوێندەوارەکانی تورک و فارس و عەرەبدا بوونی هەبووە بەهۆی ئەوەی هەر لە کۆنەوە ئەم ناوچەیە کەوتووەتە نێوان کێشمەکێشمی سەفەویی و عوسمانی و هەریەکە لە هەوڵی ئەوەدا بوون میرنشین و سەرۆک هۆزەکانیان بکەنە شوێنکەوتەی خۆیان، لەڕاستیدا ئەگەر زانایان و ئەدەبدۆستانی دەرچووی ئەو قوتابخانە ئاینییانە نەبوایە کە پارێزگارییان کرد لە شیعر و ئەدەب و میتۆد و زاراوە کوردییەکان ئێستا خاوەنی ئەو زمانەی خۆمانیش نەدەبووین.

حاجی قادری کۆیی لەوبارەیەوە دەڵێت:

**کــوردی ئاخر بڵێ چییە عەیبی** — **هەر کەلامی حەققە نییە عەیبی**
**لــەفزی کوردی بڵاو نەبوو گرد بوو** — **وا لە مابەینی ئێمەدا تێچوو**
**یا لەگەڵ فــارسی چ فەرقی هەیە** — **بۆچی ئەو ڕستە ئەم کەچەیە؟**
**باوجــودی ئەگەر بکەی دیققەت** — **تێدەگەی کام لەکامیە سیرقەت**
**چونکە ئێمە قەدیمترین لە ئەوان** — **بە تەواریخی جوملەیی ئەدیان(٨)**

بۆیە هەر کە بیری نەتەوایەتی یان ڕەگەزپەرستی لە بیری نەتەوایەتیدا سەریهەڵدا خێرا ئەو زانا مەزنانەمان دەستیان کرد بە کۆکردنەوەی مێژووی ئەم گەلە و مێژوی ئەدەب و شیعر و ژیانی شاعیر و گەورە پیاوانی، بۆئەوەی بوون و مانەوەی وەک نەتەوەیەکی ڕەسەن لەم ناوچەیەدا نەکەوێتە ژێر مەترسییەوە و نەتوێتەوە لەناو مێژووی ئەو گەلانە، دانان و وەرگێڕانی شەرەفنامەی بەتلیسی و نووسین وچاپ کردن و کۆکردنەوەی دیوانە شیعرییەکان و دانانی ڕێزمانی کوردی جوانترین نموونەن لەسەر ئەو ڕاستییە. بەتایبەتی لە سەدەی ڕابردوودا پیاوانی وەک شێخ محەمەدی خاڵ و مامۆستا عەلائەدینی سەجادی و مامۆستا مەلا عەبدولکەریمی مودەڕریس لەم بوارەدا گەورەترین خزمەتییان کردووە.

هەروەها بۆئەوەی نەوەکانی داهاتوو دانەبڕێن لە زمانی گەلانی دیکە، چونکە هێشتا بە هەزارەها شاکار و نووسین و شیعر و هۆنراوە و پەرتووکی مێژوویمان هەیە کە زاناکانی پێشوومان بەزمانەکانی دیکە نووسیویانە بەتایبەتی زمانی عەرەبی کە زمانی ڕەسمی هەموو گەلانی مسوڵمان بووە، هەروەها بۆئەوەی نەوەکانمان بەهرەمەند بن لەو زانست و پێشکەوتنانەی گەلانی دیکە پێی گەیشتوون لەبەرئەوە چەندین فەرهەنگییان

نوسیوە وەک فەرهەنگەکانی:

- «نەوبەهار» کەهی ئەحمەدی خانییە، کە لە ساڵی ٢٨٦١ز دایناوە، بە شێوەزاری کرمانجییە.(٩)

- «ئەحمەدی» کە شێخ مەعروفی نۆدێهی لە ساڵی ٥٩٧١ز دایناوە، بەشێوەزاری سۆرانییە.(٠١)

-»الهدیة الحمیدیة فی اللغة الکردیة« یوسف ضیاءالدین المقدسی لە ساڵی ٢٩٨١ نوسیویەتی (١١).

- فەرهەنگا کوردییا، جگەر خوێن.

- فەرهەنگ کوردی- کوردی، جلادت عالی بدرخان

- فەرهەنگی مهاباد، گیوی موکریانی(٢١).

- فەرهەنگی دووڕشتە هی مامۆستا عەبدولکەریمی مودەڕریس.

- فەرهەنگی خاڵ.

- هەمبانە بۆرینە.

ئەمانە و چەندین فەرهەنگی دیکەش کە دەیسەلمێنن ئەو زانا بلیمەتانەی کە لە حوجرەکانی کوردستان دەرچوون چەندە لە خەمی خەڵک و خاک و زمان و ئەدەب و شیعری کوردیدا بوون. ئەمە بێجگە لەوەی ئەو زانا بەرزانە بە سەدان نوسراو و شیعر و ئەدەبی زانایانی پێش خۆیانیان بۆ پاراستووین و بە ئەمانەتەوە گەیاندوویانەتە نەوەکانی داهاتوویان، کتێبخانەکانیان وەقف کردووە و نەیانهێشتووە ببێتە میرات بۆ نەوەکانیان نەوەک بفرۆشرێت و بچێتە دەرەوەی ئەم نیشتمانە و ئەو سامانە زانستییە مەزنانە میللەتانی دیکە خۆیانی لێ بکەن بە ساحێب وەک ئەوەی مەلا یەحیای مزوری کردوویەتی، هەروەها مامۆستای خاڵ کە هەموو نوسراوەکانی ناو کتێبخانەکەی داوەتە کتێبخانەی ئەوقافی سلێمانی.

هەروەها لەڕووی ساغکردنەوەی شیعرو نوسینی کەڵە زانیانی پێشووش زانایانی دەرچووی حوجرەکانی کورستان هەوڵێکی بێ وچانیان داوە، زانای وامان هەبووە زۆربەی تەمەنی خۆیان لەو بوارەدا سەرف کردووە، یەکێک لەو زانا مەزنانە کە ڕۆڵێکی زۆر مەزنی بینیوە لەو بوارەدا مامۆستا مەلا عەبدولکەریمی مودەڕیسە کە توانیویەتی بێجگە کۆکردنەوەی شیعری شاعیران هەوڵیدا ئەو مانا قووڵ و ئەدەبیانەی کە لە ناواخنیاندا هەڵیانگرتووە ڕاڤە بکات، ئەو دەستەواژە عیرفانییانەی کە شاعیران بەکاریانهێناوە تەواو شەرح بکات بەحوکمی پێشینەی عیرفانی خۆی و هاوڕێیەتی کردنی گەورە پیاوانی تەسەووف و پابەندبوونی بە ڕێبازی نەقشبەندییەوە، بێجگە لەوەی خۆی شاعیرێکی باشی گەلەکەمانە و شارەزاییەکی باشی لە زانستی ڕوانبێژیی و عەروزدا بووە و زۆر

ئاگاداری شیعری شاعیرانی عەرەب و فارس بووە، بەشێوەیەک لەو بڕوایەدام ئەگەر ئەو نەبوایە زۆر ئەستەم بوو خوێندەوارانی دوای خۆی لەو دەستەواژە قوڵانە تێگەیشتبانایە کە شاعیرانی وەک نالی و مەحوی و مەولەوی و..هتد لە شیعرەکانیاندا بەکاریان هێناوە، مامۆستا شەرحی دیوانی مەحوی و نالی و مەولەوی و هەندێ لەشیعرەکانی فەقێ قادری هەمەوەندی کردووە، بێجگە لە ساغکردنەوەی دەیان قەسیدە و نامە و دەستنووسی دیکە کە لەمیانەی نوسراوەکانی و باسکردنی ژیانی زانایان و گەورەپیاوانی کورد لە یادی مەردان و بنەماڵی زانیاران باسی کردوون.

مامۆستا عەلی قەرەداغی، لە میانەی باسکردنی ڕۆڵی میرانی ئامێدیدا باسی ڕۆڵی مامۆستا مەلا یەحیای مزوری دەکات لە ساغکردنەوەی شیعرەکانی مەلای جزیری بەتایبەتی شەرحی قەسیدەی «موغبەضەی مەی فرۆش»ی کردووە بە ٦٥ لاپەڕە لەسەر داوای زوبەیر پاشای کوڕی ئیسماعیل پاشای میری عیمادییە، چونکە ئەو قەسیدەیە زۆر قورسە و هەندێک دەستەواژەی عیرفانی مانا قووڵی تیادایە کە وەک مەلا یەحیا خۆی دەڵێت: لەوانەیە ئومێدم وایە بەم شەرحە گەلێک لە زاراوەکانی ڕێبازی تەسەووف ڕوون ببێتەوە(٣١).

لە کۆتاییدا دەگەینە ئەو دەرەنجامەی کە لە ڕابردوودا ئەو حوجرە و قوتابخانە ئاینییانە ڕۆڵێکی مەزنیان بینیوە لە بواری پاراستنی زمان و ئەدەبی کوردی. بەڵام ئەوەی پێویستە لە ئێستادا لەسەری ڕابوەستین ئەوەیە کە بۆچی ڕۆژ بەڕۆژ ئەم بابەتە لە حوجرە و خوێندنگە ئاینییەکاندا لە پاشەکشێدایە، لەوانەیە بوترێ لە ئێستادا تایبەتمەندییەکان لەیەکتری جودا کراونەتەوە بۆیە پێویستە فەقێ و زانای ئاینی خۆیان خەریکی زانستە ئاینییەکەیان بکەن و بەس، ئەو بابەتانە لێبگەڕێن بۆ بەشی کوردی لە زانکۆکان و ئەکادیمیا و دامەزراوە ئەدەبیەکان.

بەڵام لەڕاستیدا ئەوە بیرکردنەوەیەکی زۆر هەڵەیە، پێویستە عەقڵمەندان و زانا ئاینییەکانمان زوو فریای ئەو جۆرە بیرکردنەوانە بکەون، چونکە وەک مامۆستای خاڵ دەفەرموێ: ئەدەب و شیعر کاڵای باڵای گەلانە(٤١) توێشوی ڕۆحە و هەوێنی مەجلیس و وەعز و ئامۆژگارییە و حیکمەت و عەقڵمەندی زیاد دەکات، ئەمە بێجگە لەوەی بابەتێکە لە کرۆکی زانستە ئالییەکانی حوجرە و بووەتە هۆی زانینی ئیعجازی قورئان، بۆیە هەرگیز و هیچ کاتێک فەقێ و مامۆستای ئاینی لێی بێنیاز نییە.

بۆیە لێرەدا پێشنیاز دەکەم بۆ ئەو مامۆستا و مودەڕیسانەی لەئێستادا حوجرەی فەقێیانیان هەیە زانستی ئەدەبی کوردی و شارەزا بوون لە شیعری کەڵە شاعیرەکانمان بکەن بە بەشێک لە پرۆگرامی خوێندن لە حوجرەکاندا، بۆئەوەی مەلاکانی دواڕۆژ وەک مەلا و زاناکانی پێشوومان درێژە بەو شانازیی و خزمەتە گەورەیە بدەن.

## پەراوێزەکان

(١)فەقێ و فەقێیەتی لە کوردستان، ص٨٦-٩٦.

(٢) د.مارف خەزنەدار: مێژووی ئەدەبی کوردی، (٧٧/٣).

(٣) بڕوانە : ڕۆژنامەی هاوکاری ژمارە: (٢٧٢) وتاری: (گۆشە ئەدەبیەکانی کۆیە و ڕاپۆرتەکەی کاک مەحمود زامدار)، مامۆستا کەریم شارەزا.

(٤) محەممەد ئەحمەدیان: پێشەنگانی بیروباوەڕ مێژووی زانیانی ئایینی موکریان، ل٠١.

(٥) هەمان سەرچاوە ل٨٣.

(٦) محەمەدی مەلا کەریم: دوو بابەت لەبارەی شیعری حاجی قادری کۆییەوە، ل٩٤-٠٥.

(٧) مەم و زین ئەحمەدی خانی، ئامادە کردن و پەراوێز نوسینی: هەژار، ل٤٠٣- ٥٠٣.

(٨) محەمەدی مەلا کەریم: دوو بابەت لەبارەی شیعری حاجی قادری کۆییەوە، ل٢٣-٣٣.

(٩)بڕوانە: نەوبەهاری خانی و ئەحمەدی شێخ مەعروفی نۆدێهی، لێکۆڵینەوە و بەراوردکردنی علی فەتتاح دزەیی، چاپخانەی الشباب، أربیل ،٥٨٩١، ل٤.

(٠١) بڕوانە: هەمان سەرچاوە، ل٥٤.

(١١)من قوامیس اللغة الکردیة.. قاموس جودی.. لقاء مع الکاتب نعمت حسین باجلوری ptth://www.alnoor.se/article.asp?id=٢٠٦٧٣٧.

( ٢١) هەمان سەرچاوەی سەرەوە.

(٣١) بڕوانە: م. محمد علی قەرەداغی: بایەخدانی میرانی ئامێدی بە ڕۆشنبیری لە دەڤەری بادیناندا، ل٣٢-٤٢.

(٤١) شێخ محەمەدی خاڵ: ناڵەی دەروون، ل٣١٢.



د. ئەحمەد شافیعی

# ڕۆڵی حوجرەکانی کوردستان لە ڕابردوودا لە پێشخستنی ئەدەب و زمان و زانست و بیری نەتەوەییدا

ڕوون و ئاشکرایە لەوکاتەوە ئایینی ئیسلام لەم وڵاتەی ئێمە بڵاوبۆتەوە نەتەوەی کورد بە ویست و ئارەزووی خۆی بێ هیچ زۆرێک و دڵەڕاوکێیەک ئایینی پیرۆزی ئیسلامی وەرگرتووە و چووەتە ناو ڕیزەکانییەوە. هەر لەگەڵ گەشە و بڵاوبوونەوەی ئایینی ئیسلام لە کوردستانی خەڵکەکەی کەوتنە بیر و سەودای پەیداکردنی شارەزایی لە بنەماکانی ئیسلام و فێربوونی زانست و زانیاریی و خوێندن و نووسین و تێگەیشتن لە دەقەکانی قورئانی پیرۆز و فەرموودەکانی پیغەمبەر (د.خ).

پاش گەشەی ئایینی پیرۆزی ئیسلام لە کوردستان سەدان مەڵبەند و بنکەی تایبەت بە فێربوون و نووسین و زانست و زانیاری لە شار و شارۆچکە و گوند و لادێکان دروستکرا، کە منداڵانی کورد هەر لەو ڕۆژەوە ڕوویان کردە ئەو شوێنانە بۆ فێربوونی خوێندەواریی و نووسین. ئەو مەڵبەندانە هەر لەو ڕۆژگارانەوە ناوی لێنرا (حوجرە) لە تەک مزگەوت و تەکیە و خانەقاکاندا. فێرخوازانیش پێیان دەوترا (قوتابی- فەقێ). بەم پەرۆشییەوە (منداڵانی کورد) حوجرەکانیان ئاوەدان کردەوە و کڵاو و جامانەی فەقێیەتیان لەسەرنا، بە گەرما و سەرما، لە نزیک و دوور، بە نەبوونی و بێ کەسی، بەدەیان سەختی و هەژاری، بە دوورکەوتنەوە لە زێدی باب و باپیر و کەسوکار خۆیان پێگەیاند و ئەم ئایینە پاکەیان بڵاوکردەوە و خزمەتیان بە خاک و خەڵک و ئایین و ئەدەب و زانست و زانیاریی و شیعر و نووسین و کەلتوور و نەتەوەیی خۆیان کرد. ئەم حوجرانە بوونە خێرێکی نەبڕاوە و هەمیشەیی و مێژوویەکی پرشنگداری گەشاوە بۆ کورد و کوردستان، بەشێوەیەک هەتا هەتایە مێژوو شانازی پێوە بکات.

دەتوانین بڵێین: حوجرەکانی کوردستان بەدرێژایی چەندەها سەدە هەروەکو فێرگەی ئایین و سەنگەری پارێزگاری لە ئایین و نیشتمان و نەتەوە بوون، هەر ئاواش جێداری قوتابخانە و زانکۆ و کۆلێژ و پەیمانگاکان بوون و بە درێژایەتی چەندەها سەدە تاقانە سەرچاوەی زانست و زانیاریی و مەکۆی پەروەردەکردن و بارهێنانی زانایان و ڕووناکبیرانی وڵات بوون.

دەرچووانی ئەم حوجرانە کە پێیان وتراوە (مەلا یان ماموستای ئاینی) هەمیشە نووری ڕوشنایی و کانیاوی زانست و زانیاریی و چرای داگیرساوی هیدایەت و تیشکی زێڕینی دڵسوزی بوون بۆ یەکەیەکەی تاکەکانی ئەم نیشتمانە. هەمیشە هەوڵ و تێکۆشانیان بە جۆرێک بووە بە قازانج و لایەنێکی پرخێر و چاکە بۆ کورد و کوردستان تەواو بێت، چونکە کۆشش و کار و هەنگاوەکانیان لەپێناو خەمی خەڵک و خاک و بڵاوکردنەوەی ڕۆشنبیریی و زانیاریی و هێمنی و ئارامی و سەقامگیرییە کۆمەڵگاکەیان تەرخان کرد.

سەرهەڵدان و دەرکەوتنی بیری نەتەوەی کورد لە ڕێگەی حوجرە و مەلای کوردەوە بووە. لەو ڕێگەشەوە چەندین کەسایەتی ئایینی بوونەتە ڕێبەر و پێشەوای بزاڤ و جوڵانەوەی نیشتمانی و نەتەوەی کورد. ڕۆڵی مەلای کورد هەر بەتەنها لە چوارچێوەی مزگەوت و حوجرە و کاری ئایینی کورت نەکراوەتەوە و قەتیس نەبووبێت، بەڵکو لە مێژووی گەلی کورددا ڕۆڵی منەوەر و نوخبەی ڕۆشنبیریان گێراوە، ئەمەش لە چەند ڕوویەکەوە دەردەکەوێت:

### ١ – لەڕووی مێژووییەوە:

هەرکەس بهوردی چاوێک بخشێنێتەوە بە مێژووی نەتەوەی کورددا، ئەو ڕاستییەی بۆ دەردەکەوێت  کە زانایان ئایینی و مەلای کورد لە هەموو قوناغەکاندا حوزورێکی کارا و باڵایان هەبووە. هیچ کات بە دەرنەبوون لە کێشە و پێشهاتی نەتەوەی خۆیان و بگرە بەردەوامیش بەشێک بوون لە چارەسەر و گەیشتن بە کەناری ئارامی. بەڵگەی زیندووش ئەمەیە: لهلایەکەوە زۆربەی سەرکردە و شۆڕشگێڕ و نەتەوەپەروەر و ئەدیب و شاعیر و ڕۆشنبیر و بیریار و بلیمەتە دیار و هەڵکەوتووەکانی کورد مەلا و زانای ئایینی بوونە (خەریجی حوجرە). لەلایەکی تریش ئەگەر مێژووی زانایانی ئایینی لە مێژووی کورد جیا بکەینەوە شتێکی ئەوتۆی لێ نامێنێتەوە. کەوابوو لە ڕەوڕەوەی مێژوودا زانایانی ئاینی و حوجرە و فەقێ خاوەنی چەندین داستانی شکۆمەندیی و شاکاری گەورەیی و خۆنەویستی بوون کە تا ئێستاش مرۆڤایەتی قەرزاری زانست و داهێنان و لێبڕان و دڵسۆزی زانایانییەتی.

### ٢ – لەڕووی ئینتیما و بیری نەتەوەیی:

زانایانی ئاینی–و دەرچووی حوجرەکان، بەردەوام ئینتیمای نیشتمانیان هەبووە و کاریشیان بۆ کردووە، حوزوری بەردەوامیان بووە بۆ بەشداری لە پرسە هەستیارەکان و پێشهاتە نەتەوەیی و پرسە نیشتمانییەکان. هەریەکەیان بهگوێرەی توانا و لێهاتوویی و ئاستی هوشیاریی و ڕۆشنبیری خۆی. مەلای کورد لەگەڵ ئەداکردنی ئەرکە پیرۆزەکەیان هەمیشە هەوڵی داکۆکی کردن و بەدەستهێنانی مافی ڕەوای کوردیان داوە. بەردەوام شەیدای ئەوە بوون گەلی کورد سەرفراز بێت و لە هەموو بوارێکەوە پێشکەوتن بەخۆیەوە ببینێ. مەلای گەورەی کۆیە بەردەوام بیری لە دۆزینەوەی ڕێگای ڕزگاربوونی نەتەوەی کورد کردووەتەوە، وەک لە شیعرێکدا ئاماژەی پێداوە:

**هەتا دەمرم لە بۆ کوردان دەناڵم        عیلاجیان چۆن بکەم هاوار بەماڵم**

بۆ ئەمەش مەلایانی کورد خەباتی شار و شاخیان بووە، موشارەکەی فیعلی شۆڕش و کوردایەتی و بەرەی بەرگریکردنیان تێدا بووە. قوربانیشیان لەم پێناوەدا داوە، لەسەریشی ڕووبەڕووی فشار و هەڕەشە و ئەشکەنجە و گرتن و ئازار و دەربەدەری بوونەتەوە هەتا ڕادەی ئیعدام و پەتی قەنارەش، کۆڵیان نەداوە و چۆکیان نەوی نەکردووە. هەستی نیشتمانی بەشێکی دانەبڕاوی بیری هەموو زانایان بووە. خزمەتێکی دیاریان بە خاک و زمان و نەتەوەکەیان کردووە. ئەتوانم بڵێم: سەرهەڵدان و دەرکەوتنی بیری نەتەوەیی کورد لە ڕێگەی حوجرە و فەقێیان و زانایانی دەرچووی حوجرەکانەوە بووە.

هەر لەو ڕێچکەشەوە چەندین کەسایەتی ئایینی و زانا بونەتە ڕێبەر و پێشەوای بزاف و جوڵانەوەی نیشتمانی لە هەر چوار پارچەکەی کوردستان .نمونەی مێزەرەکەی پێشەوا قازی محەمەد و شێخ سەعیدی پیران و شێخ عوبەیدوڵڵای نەهریی و شێخ عەبدولسەلامی بارزانی و شێخ مەحمودی نەمر و مەلا مصطفی بارزانی باشترین نموونەی قوربانیدان و خەبات و شۆڕش و تێکۆشان و بەرخودان بوون لە مێژووی گەلی کورددا. لە ساڵی ٥٢٩١ لە شاری دیاربەکر لە کاتی لەسێدارەدانی شێخ سەعیدی پیران و چل و شەش لە هاوەڵانی تێکۆشەری، شێخ سەعیدی پیران وەک سەرکردە و زانایەکی ئایینی و تێکۆشەرێکی کورد لە بەردەم پەتی سێدارە وتەیەکی گەوهەرداری بۆ مێژوو تومار کرد و وتی:((من گەیشتمە کۆتایی ژیانی ئاسایی خۆم و پەشیمانیش نیم لەوەی کە ژیانی خۆم لەپێناوی نیشتمانەکەم و لەپێناوی گەلەکەمدا دەکەمە قوربانی و ئەوەندەمان بەسە نەوەکانمان لە بەردەمی دوژمندا شەرمەزار نابن)).

شەوێک بەر لەسێدارەدانی مامۆستا و پێشەوا و سەرکردەی دڵسوزی خەڵک و خاک و نیشتمان قازی محەمەد، فەرمووی: ((ڕەنگە بێت بەخەیاڵتانا کە من (قازی محەمەد) بۆچی سەرنەکەوتم؟ لە وەڵامدا دەڵێم: بەخوای گەورە سوێند دەخۆم کە من سەرکەوتووم، چ نیعمەتێک و سەرکەوتنێک باڵاتر و زۆرترە لەوەی کەوا خەریکم گیان و ماڵ و سامانی خۆم لەڕێی میللەت و نیشتمانی خۆمدا دەبەخشم، باوەڕ بکەن من لە ناخی دڵەوە ئارەزوی ئاوا ڕۆژێکم دەکرد. بە خۆمم دەگوت: ئەگەر مردنم بە جۆرێک بێت کە لە خزمەتی خوا و میللەتی خۆمدا سەربەرز بم، ئەو مەرگە بۆ من پیرۆزە و سەرکەوتنە)).

گیانی نەبەزیوی پێشەوا قازی بەم جۆرە بوو کە بەر لەسێدارەدان فەرمووی:((من تا مردن لەگەڵ ئێوەدا دەبم، دەمەوێت ئەوەتان پێ بڵێم: ئەگەر لەپێناو کورددا نەمرم یانی هیچم بۆ کورد نەکردووە، بۆیە چاوەڕوانی ئەوەم لێمەکەن کوردستان بەجێ بهێڵم و بڕۆم. من بەڵێنم بە میللەتەکەم داوە لە خۆشی و ناخۆشییەکانیان لەگەڵیان بم، نامەوێت لەپێناو سەلامەتی گیانم شەرمەزاری خوا و خەڵک بم !)). پێشەوا قازی بە حوکمی زیرەکی و لێهاتوویی و هەوڵ و کۆششەکانی جگە لە زمانی کوردی، زمانەکانی عەرەبی، فارسی، ئینگلیزی وفەرەنسی و ڕووسی و تورکی زانیوە. لە چ کۆلیژێکی زمان خوێندی، حوجرە چ پیاوانێکی گەورەی پێشکەش کرد.

(هێمن)ی شاعیر دەربارەی قازی دەڵێت:

**زانا بوو، کورد پەروەر بوو – پیشەوا بوو، ڕابەر بوو**
**هەر کورد نەبوو بەشەر بوو – خەمی خەڵکی لەسەربوو**

**٣- لەڕووی شیعر و ئەدەب و پەخشان:**

هەروەک ئاماژەمان پێدا ڕۆڵی مامۆستایانی ئاینی هەر بەتەنها لەچوارچێوەی مزگەوت و کاری ئایینی کورت نەکراوەتەوە. بەڵکو زانایانی ئایینی لە مێژووی گەلی کورددا ڕۆڵی منەوەر و نوخبەی ڕۆشنبیریان گێڕاوە، بەجۆرێک: شانازی بە ئەدەبی و کەلتوورییەکانی ئێمە لە سەرەتای خۆناسین و کورد و دەفتەر و نووسینەوە زۆرینەی زۆری لە حوجرەکانی کوردستان بەرهەم هاتووە. زۆربەی پێشەوایانی ئەدەبیات و شیعری کوردی پەروەردەی بەردەستی زانایانی حوجرە و فەقێ هەژار و لانەوازەکانی ناو مزگەوتەکانی کوردستان بوون.

هەر لەو حوجرانەدا شاعیر و هەستیارانی وەک: (ئەحمەدی خانی، مەلای جەزیری، مەولەوی، نالی شارەزوور، مەحوی، بێسارانی، سالم، حاجی قادر کۆیی، حەریق، شێخ ڕەزای تاڵەبانی، عەبدوڵڵا بەگی گۆران، بێکەس ، عەلادین سەجادی، قانع، زێوەر، پیرەمێردی نەمر، هەردی، شێخ نوری شێخ صالح، تاهیر بەگی جاف، فەقێ قادر هەمەوەندی، بێخود، خادیم، شاهۆ، تەنانەت مەستورەی ئەردەڵان. کوردی، موفتی پێنجوێنی، بەیتووشی، هێمن موکریانی، هەژار، دەیان و سەدانی تر گەر لاپەڕەکانی ژیانیان هەڵدەینەوە ئەبینین سەرەتا بە کەلتوور و فەرهەنگ و ئەدەبیاتی حوجرەکان زمانیان پژاوە.

هەژاری موکریانی و هێمنی شاعیری هاوڕێی ئەو ئەدەبە بەرزە پاراوەیان لە کوێ هێنا و کێ فێری کردن. مامۆستا هێمن شاعیر سەبارەت بە ئاوڕدانەوەی مەلاکان لە ئەدەب و فەرهەنگی کورد نووسیویە:((ئەو سەردەمە کە وەک سوختەیەکی نەزان لە خانەقای شێخی بورهان بووم. دەوری مەلا و زاناکان و موستەعیدە باشەکان لەسەر شیعری نالی دەڕۆن، ئەگەر نیوە خوێندەواری وەک منیان بۆ حاڵی نەبوویان، هیچ نەبێ سەرنجیان بۆ لای مەلە لەو دەریا مەند و بێ بەستێنە ڕادەکێشا)).

مەلا محەمەد ئەحمەدیان لەسەر ڕەنگدانەوەی ئیسلام لە شیعری کوردیدا ئەڵێت:((ئەگەر بەنیازی هەڵبەستنی مێژووی پڕ لە شانازی لە خۆمانی نەگۆڕین، کۆنترین بەڵگەی نووسراومان هەر ئەو شیعرە کوردیانەن کە مەلای وەک: خانی و بێسارانی و جەزیری لە سووچی حوجرە و لەکاتی حەسانەوە و بێکاریدا دایانناون و بە ڕێنووسی عەرەبی و فارسی نووسیویانەتەوە، ئەو مەلایانە پێشەنگ و ڕچەشکێنی زمان و ئەدەب بوون، بناغەدانەری ئەدەبی نووسراومان مەلا بوون)). هەربۆیە گەورەترین شاعیرانمان یا مەلا بوون یا پەروەردەی قوتابخانەکانی ئایینی بوون، وەک نالی، سالم، مەولەوی، حاجی قادر، وەفایی، حەریف، مەحوی.

**٤ – لەڕووی زانست و زانیاری و نووسین و ڕۆشنبیرییەوە:**

لەڕووی زانست و ڕۆشنیریی و نووسینەوە مەلای کورد هەر لە کۆنەوە تائێستاش لە بواری نووسین و تەدریس و زانست و زانیاریی و لێکۆڵینەوە و بڵاوکردنەوەی ڕۆشنبیریی و داهێنان و زمان و ئەدەب شیعر و وتار و پەیام ڕۆڵێکی پێشەنگی و پێشەوایەتیان پێشکەش کردووە. هەمیشە مەشخەڵێک بوون بۆ ڕووناککردنەوەی نەوەی نوێی نووسین و داهێنانەکانیان بوون بە پەیڕەو و پرۆگرام بۆ خوێندن لە زۆرێک لە کۆلێژ و زانکۆکانی جیهانی عەرەبی ئیسلامی. بێجگە لە سەدان دیوانی شیعریی و هەزاران کتێبی بەسود بە زمانی عەرەبی و کوردی و تورکی و فارسی لە بوارە جیاجیاکانی زانست و ژیان. بەر لە سەرهەڵدان و پەیدابوونی قوتابخانە میرییەکان و پەیمانگا و کۆلێژ و زانکۆکان، تاکە سەرچاوەی خوێندن و خوێندەواری لە کوردستان تەنها و تەنها (حوجرە و مزگەوت و خانەقا و تەکییەکان) بوون. ئەو حوجرانە بوونە مەڵبەند و مەکۆی خوێندن و خوێندەواری و ڕۆشنبیری.

لەم حوجرە بێ تفاق و کەم دەرامەتانە چەندین کەڵەپیاوی گەورە و زانا و پیتۆڵ و بیرمەند و پێشەوا و ئەدیب و نوسەری وا گەورەیان تیا هەڵکەوت کە توانیان خزمەت بە ئایین و نەتەوە و نیشتمانەکەیان بکەن و مێژوویەکی جوانی پڕ شکۆ بۆ نەتەوەکەیان تۆمار بکەن. لەوانە: ) ئیبن صلاح شارەزووری، ئیبن حاجب کوردی، ئیبن الحاج ئالانی دینەوەری، باقلانی، حافیظ عێراقی، ئیبن خەلەکان، مەلا ئەبوبەکر مصنف چۆڕێ، یوسف الأصم، ئیبن ئەثیر، حەیدەرییەکان، شێخ مەعروفی نۆدێ، عەللامە بەیتووشی، ئیبنو ئادەم، مەلا عەلی قزڵجی، مەلا عەبدولڕەحانی پێنجوێنی، مەلا شێخ عومەر قەرەداغی، مەولانا خالیدی نەقشبندی، شێخانی گەورەی بیارە، حاجی کاک ئەحمەدی شێخ، سەعید نورسی، مەلا ئەفەندی هەولێر، مەلای گەورەی کۆیە (جلی زادە)، مەلا محەمەد قزڵجی، شێخ محەمەدی خاڵ، مەلا باقر باڵەک، مەلا عەبدولکەریمی مودەڕیس، مەلا ئەحمەدی نۆدشێ، مەلا عوسمانی هەڵەبجە، مەلا صاڵحی کۆزەپانکی، ئامێدی، مەلا خەلیل سیرێ). ئەمانە و سەدانی تریش هەموو هەڵقوڵاوی حوجرەن و لە حوجرەوە سەریان هەڵداوە.

ڕەنگە بۆ هەندێ کەس سەیربێ ئەگەر بڵێین، دامەزراندنی ڕۆژنامە و ڕۆژنامەوانی بۆ هەوەڵین جار لە کوردستانی ڕۆژهەڵات فەقێیەکی حوجرەکانی سابڵاغ بەرپرس و بەڕێوەبەری بووە. ساڵی: ٠٤٣١ی کۆچی لە ورمێ ((مەلا محەمەد تورجانی قزڵجی)) نەوەی عەللامە مەلا عەلی قزڵجی ڕۆژنامەی بە زمانی کوردی بەنێوی (کورد) لەچاپ داوە، دوایی لەبەرئەوەی ئاوارەی میسر و حیجاز و عێراق بووە لە عێراق کۆچی دوایی کردووە.

هەروەها مەلای گەورەیی کۆیە (مەلا محەمەدی جەلی زادە) لە سەردەمی خۆیدا ڕیفۆرمخواز، شاعیر، فەیلەسوف، موتەکەلیم، زمانەوان، پێشەوای میللی گەلەکەی بووە. تەفسیرەکەی هیچی لە تەفسیرەکەی محەمەد ڕەشید ڕەزا و محەمەد عەبدەی میسری کەمتر نەبووە. بەردەوام بیری لە دۆزینەوەی ڕێگای ڕزگاربوونی نەتەوەکەی کردووەتەوە. هەڵکەوتووی ڕۆژگاری خۆی (موفتی زەهاوی) ئەو مەلا کوردەی ماوەی چل ساڵ موفتی بەغداد و سەرۆکی زانایانی عێراق بووە، گەورە مەلای وەک عەللامە مەلا عەلی قزڵجی و مەلا عەبدوڵڵا پیرە باب و مەلا محەمەد مەحوی فەقێی بوون، شێخ ڕەزا لە ڕادەی زانایی موفتی زەهاوی سەری سوڕماوە و دەڵێت:

**مومکین نیە ئیدراکی حەقایق بەتەواوی**
**مومکین نییە ئیدراکی نەکا زیهنی زەهاوی**

لە سەردەمێکدا کەس ئاگای لە کاریگەری وشە و زمان نەبووە. مەلا کورد خاوەنی دیوان و دەوات و قەڵەم بووە. ((رشتەی مرواری، فەرهەنگی خاڵ، ئەحمەدی، دوڕشتە، هەمبانە بۆرینە)ی نووسیوە . مەلا خدری نالی لە (مەککە) بووەتە مەرجەعی زمانەوانی و، سەفیری عولەمای کوردستان بووە لە ناو زانایانی حەرەمەیندا. مەلا مەحمود هەمزاوایی موفتی شام بووە، تەفسیری بێ نوقتەی لە هەموو قورئان کردووە لە دوو بەرگی گەورەدا، بەناوی ((در الأسرار في تفسير القرآن بالحروف المهملة))، کە نزیکەی (٥٤٢١) هەزار و دوو سەد و چل و پێنج لاپەڕەیە. ئێجگار ئێجگار سەرسوڕهێنەرە لەڕووی ئەدەبی و داڕشتن و عیرفانەوە، بتوانی تەفسیری هەموو قورئانی پیرۆز بکەیت بەو پیتانەی نوقتەیان نیە.

عەللامە (فصيح حيدري) لە کتێبەکەی (عنوان المجد)دا دەڵێت: ((ئەگەر زانستی ناو کتێبان ڕەش بووبانەوە، ئیبنو ئادەم شیاوی ئەوە بوو لە بیرکردنەوەی خۆی هەموویان بهێنێتەوە سەر لاپەڕەکان واتە جارێکی تر بیاننوسێتەوە، عیلمی ئیبنو ئادەم سنووری خەیاڵی تێپەڕاندبوو، وەک بەرهەمەکانی سنووری ژمارەیان بەزاندبوو)). تاقانەی ڕۆژگاری خۆی بووە، زیاتر لە سەد بەرهەم و پەراوێز و بابەتی جۆراوجۆری لەسەر زانستە عەقڵیی و نەقڵییەکان هێناوەتە بەرهەم.

سەید ئەحمەدی فائیز بەرزنجی لە ئەستەنبوڵ ئەندامی ئەنجومەنی باڵای (مەعاریف) بووە، شاکاری گەورەی وەک (كنز اللسن) بە یادگار بۆ بەجێهێشتوین. گەنجینەیەکی ئێجگار گەورە و سەرسوڕهێنەرە، کە بە شەش زمان و دوانزە هونەر (علم) نووسیویە. زمانەکانی: کوردی، عەرەبی، فارسی ، فەرەنسی ، ڕووسی. زانستەکان:(علم الكلام، علم

التفسير، علم الحديث، الفقه، النحو والصرف، علم الحكمة، المنطق، معان، بيان، بديع، آداب).

– لەڕووی نووسینی کوردییەوە دکتۆر مارف خەزنەدار نووسیویە: گومان لەوەدا نیە مەلایانی کورد لە حوجرە وانەکانی زمانی عەرەبییان بە کوردی دەگووتەوە. بەڵام لە سەدەی شازدە بە پێویستیان زانی ئەم سەرچاوانە بە زمانی کوردی بخرێنە سەر کاغەز. ئەم هەستە کۆمەڵێک خوێندەواری بزواند، لەوانە: مەلا عەلی تەڕەماخی، هەوڵیدا زانستی (صرف) بە کوردی بنوسێتەوە لەساڵی ۱۹۵۱ ئەم مەلایە هەوەڵین زانای کورد بووە کە بە زمانی کوردی (کرمانجی) زانستی سەرفی نووسیوە. هەروەها مەلا یونسی هەڵقەتەینی کە لە ساڵی ٥٨٧١ز کۆچی دوایی کردووە، سێ نامیلکەی خوێندنی حوجرەی بە کوردی نووسیوە: ((تەرکیب – تەسریف – زورووف). هەروەها مەلا خەلیلی سێرتێ کە لە ٣٤٨١ کۆچی دوایی کردووە، لە بواری وشەی کوردیدا لە حوجرەی مزگەوت زۆر کۆششی کردووە، لەو سەردەمەدا چەندین نامیلکەی بە زمانی کوردی نوسیوە، لەوانە نەهجولئەنام لە زانستی عەقیدە، تەجوید.(١)

زۆر ڕاستی فەرمووە حاجی قادری کۆیی:

**ئەمانە پاکیان کورد بوون نـــهایەت**
**لەبەر بێ دەفتەری ون بوون و فـانی**
**کتێب و دەفتەر و تەئریخ و کـــاغەز**
**بە کوردی گـــەر بنوســـرایە زەمانی**
**مەلا و زانا و شێخ و میر و پادشامان**
**تاکـو ئەبەد دەمـــا نـــاو و نیشـــانی**

مەلا محەمەدی ئەحمەدیان لە کتێبی(مێژووی زانایانی موکریان) نوسیوویەتی: لەو حوجرانەدا بە درێژایی سەدان ساڵ بێ پسانەوە لە دڵی تاریکە شەودا سەدان خۆریان لێ هەڵاتووە و سەرچاوەی ڕۆشنبیریی و زانستی عەقڵی و نەقڵی بوون.

حاشا لەو ڕاستیە ناکرێ تا ماوەیەک لەمەوبەر سەرچاوەی خوێندن و ڕووناکبیری و نەتەوەخوازی و ئەدەب پەروەریی و هونەردۆستی لە کوردستان تەنیا مزگەوت و حوجرە بووە و بەس. چ بزووتنەوەیەکی ڕزگاریخوازی هەبووە لە کوردستان کە زانایەکی ئایینی بە مێزەری سپی و عەبا و جبەی شۆڕەوە لە پێش چەماوەوە نەبووبێ. مەلای کورد لەگەڵ ئەوەی زۆربەیان هەڵگری ئاڵای شەریعەت بوون بە هەناسەیەکی میللی و نەتەوایەتی بانگەوازیان بۆ خواپەرستی کردووە. هەر بۆیە مێژووی نەتەوەی کورد شانازی بە حوجرە دەکات و شانازی بەو کەسایەتیانەی لە حوجرە هاتوونەتە دەر.

مامۆستا مەسعود محەمەد کوڕی مەلای گەورە نووسیویە:((دەبینی مەلایەکی کوردی

ڕووت و برسی، بێ پارە و پوول لەسەر بەردێکی ڕەق لە دەوری کانیاوی گوندێکی هەژاری کورد. خەریکە فەلسەفەی (ئەفلاتوون) و مەنتیقی (ئەرەستۆ) هەندەسەی ((ئیقلیدۆس)) و فەلەکی (بەتلەمیووس) و شەریعەتی ئیسلام زانستەکانی موعتەزیلی و ئەشعەریی و ئەدەبی موتەنەبی و موعەررا و سەعدی و حافزی شیرازی بە ڕەوانی بەوپەڕی زانابییەوە دەڵێتەوە بە فەقێیەکی کوردی لە خوی ڕووت و برسی تر.

لە قاهیرە و ئەستەنبوڵ و شام و بەغداد و لاهوور و تونس و مەڕاکیش و فاس و زانستگاکانی ئەوروپای پێش پێنج سەد ساڵ چ ماددەیەک دەخوێنرا، هەمان ماددە لە هەرتەلی و عەبابەیلێ و شارەزوور و ڕۆستی ڕەواندز و دێیەکانی وەک ئەمانە دەخوێنرا. لە هەموو ناوچەکان کوردستان لەبەر چرای فتیلە و لەسەر حەسیری شڕ، واش بووە بێ چرا و حەسیر دەرس دەگوترایەوە. بەڵام پێویستە لێرەدا پرسیارێک بکرێت، بۆ ئاسۆی حوجرە ئەمڕۆ تەم گرتوویەتی؟؟ بۆ ئەستێرەی لێ هەڵنایە؟ بۆ سەردەمی زێڕینی حوجرە لە کزیدایە؟ ئەرکی سەرشانمانە چرای ئەو حوجرانە نەکوژێنینەوە. ئەگەر فویان لێبکەین، فوومان لە کەسایەتی ئایینی و زانستی و نەتەوەیی و مێژوویەکی پڕ سەروەری خۆمان کردووە.

**پەراوێز:**

١ – د.مارف خەزنەدار: مێژووی ئەدەبی کوردی، ج٢، چاپی دووەم، ٢٠١٠، ل٤٧١.

**سەرچاوەکان**


١ـ فاخر عالی خان: ڕۆڵی زانایانی ئایینی لە ژیانی سیاسی هەولێردا، چ١، ٢٠١٤.

٢ـ د.عومەر عەبدولعەزیز: کۆماری کوردستان و پێشەوا قازی محەمەد، چ١، ٢٠١٦.

٣ـ محەمەد ئەحمەدیان: مێژووی زانایانی موکریان، انتشارات کردستان، سنندج.

٤ـ سەلاحەدین باقر عەبدول: پێگەی زانایانی ئایینی لە ئەرک و بەرپرسیارێتیدا، چ١، ٢٠١٥.

٥ـ مەلای گەورە(محەمەد کوڕی عەبدوڵڵای جەلیزادە)، پرۆژەی کتێبی TRN٤ ، ٢٠٢١.

٦ـ كنز اللسن المكنوزفيه ستة ألسن واثنا عرفنا العلامة السيد أحمد فائز البرزنجي.

٧ـ دور الأسرار في تفسير القران بالحروف المهلة لمحمود بن محمد الحمزاوای مفتي الديار الشامية.

٨ـ عەبدولڕەزاق عەبدولڕەحمان تەویڵەیی، کورتەیەک لە ژیاننامەی مەلا گۆرانی شارەزووری، چ١، ٢٠١٩.

مەلا مەحموودی چلەکێشی جوانڕۆیی کوڕی مەلا محەمەد مەهدی لە وەچەی شاعیری مەزنی کورد، مەلا مستەفای بێسارانییە. لەگەڵ ئەوەی کە زانایەکی پایەبەرز و باوکی مەلا محەمەدی قازییە، بەڵام تا ئێستا وەکوو پێویست لەسەر ژیان و بەرهەمی ئەم گەورە زانایە شتێک بڵاونەکراوەتەوە، ئەوەی کە لە دووتوویێ چەن کتێبێکدا لەبارەی ئەم زاتە نووسراوە لە چەند دێڕ زیاتر نییە، مەلا مەحموودی چلەکێش ساڵی ٥٥١١ لەدایکبووە. یەکێک لە زانا پایەبەرزەکانی مەکتەب و حوجرەی هەڵانی جوانڕۆ بووە، لە وەرزی زستاندا ٣-٢ مانگ لە تەنیایی بەسەر بردووە و کاتەکانی بە بیرکردنەوە و زیکری خودا و خۆپارێزی، دوور لە وانەوتنەوە و هەڵسوکەوت لەگەڵ خەڵکدا بەسەر بردووە هەربۆیە بە «چلەکێش» ناسراوە. ئێستا دوو بنەماڵەی فەخریی و قازیزادەی لە شاری جوانڕۆ لە وەچەی ئەم زانایەن و لەو سەردەمەوە تا ئێستا چرای زانست لەم بنەماڵەیە نەکوژراوەتەوە.

دەگێڕنەوە کە مەلا مەحموود پێنج کوڕی هەبووە (حسەینزادەی ئایشەدۆڵی٧:٧٧٣١). کە دوانیان هەر بە لاوی مردوون. ئەو سێ کوڕەی تریشی گەورەیان مەلا عەبدولقادری یەکەم بووە کە زانایەکی باش لە بواری ئەستێرەناسی بووە. کوڕی دووەمی مەلا مەحموود، کە لە هەموویان بەناوبانگترە مەلا محەمەدی قازییە کە مامۆستای مەولەی شاعیر بووە (مەولەوی تاوگۆزی ٦٨٣١:١١). سەبارەت بە ژیان و بەرهەمی ئەم گەورە زانایە وتارێکی تایبەت و تێروتەسەل پێویستە. سێیەمیان ناوی مەلا محەمەد حەسەنی ناو بووە. مەلا مەحموودی چلەکێش ساڵی ٢٣٢١ماڵاوایی لە ژیان کردووە و لە گۆڕستانی شێخ ئەبووبەکری جوانڕۆ نێژراوە. جگە لەمە هیچ زانیارییەکی تایبەت لەسەر ژیانی مەلا مەحموودی چلەکێش بەردەست نییە.

### ڕاستکردنەوەی هەڵەیەک کە لە هەندێک لە سەرچاوەکاندا هاتووە:

ئەوەی نووسەری ئەم وتارە دەستیکەوتووە ئەوەیە، یەکەم جار بەشێوەی دەقی نووسراو لە پێشەکی کتێبی «تاریخچە جوانرود» کە لەلایەن مەلا ئەحمەدی فەخری نووسراوە ئاماژەی بەوە داوە کە شێخ عومەری زیائودین لای مەلا مەحموودی چلەکێش خوێندوویەتی، و چیرۆکێکیش دەگێڕنەوە کە شێخ عومەر لە ملەی سەفیاوا تا دەرەوەی گۆڕستانی شێخ ئەبووبەکری جوانڕۆ، لەبری ئەوەی سواری ئەسپ بێ، بە پێ ئەو مەودایەی بڕیوە و فەرموویەتی مامۆستام لێرەدا و بە کارێکی بە دوور لە ئەدەبی دەزانم کە بە سواریی بە لایدا تێپەڕم. (حسەینزادەی ئایشەدۆڵی٧:٧٧٣١). مامۆستا محەمەد عەلی سوڵتانی لە کتێبی «تاریخ تسنن در کرمانشاهان» گومانی لەسەر ڕاستبوونی ئەم بابەتی سەرەوە کردووە (سوڵتانی ٠:٨٣١:٥٣١). بەڵام سەیر ئەوەیە ئەم چیرۆکە لە کتێبەکانی

پاش ئەو کتێبەش دووپات کراوەتەوە. هەربۆیە جارێکی تر ئاماژە بە هەڵەبوونی ئەم بابەتەی سەرەوە دەکەین. بەڵگەش ئەوەیە، ئەگەر بڕوانینە بەرواری لەدایکبوون و وەفاتی مەلا مەحموود و بەراوردی بکەین لەگەڵ ساڵی لە دایکبوونی شێخ عومەردا، ئەوەمان بۆ دەردەکەوێت کە ئەم دوو کەسایەتییە لە یەک سەردەمدا نەژیاون. چونکە مەلا مەحموود بەپێی هەموو سەرچاوەکان ساڵی ۲۳۲۱ وەفاتی فەرمووە، ئەوە لەکاتێکدایە کە شێخ عومەر ۳۲ ساڵ پاش وەفاتی مەلا مەحموود، لە ساڵی ۵۵۲۱ لەدایکبووە. کەواتە خوێندنی شێخ عومەر لای مەلا مەحموودی چلەکێش دوورە لە ڕاستی. سەبارەت بەو چیرۆکەش کە باس کرا، ئەوەش دەبێ هەڵە بێ، مەگەر ئەوەی کە وای بۆ دانێین کە شێخ عومەر وەکوو ڕێزێک بۆ ئەو مەلا پایەبەرزە ئەم کارەی کردبێ، ئەگینا ناتوانێ ڕاست بێ.

**دوو نامەی مەولانا خالید بۆ مەلا مەحموودی جوانڕۆیی**

لە کتێبی مەکتووباتی مەولانا خالید لە لاپەڕەکانی ۳۸۵ و ٤٨٥ دوو نامەی مەولانا خالید بۆ مەلا مەحموودی جوانڕۆیی نووسراوە.

نامەی یەکەم: نامەیەکە بە زمانی فارسی و دەقەکەی زیاتر وەک نامەیەکی هەواڵپرسی دێتە ئەژمار. ئەمەش دەقی نامەکەیە:

جناب استاد أجل وفادار، و ولی نعمت قدیم با فضل و وقار را به بشارت التفات خاص مبشریم: اگرچه تبشیر فقرا نسبت به فیض طلاب طریقه علیه خارج از قانون است و چونکه عبارت آرایی و تعارف رسمی منافی روش فقراست و آن جناب (بحمدالله) مستغنی از پندارند، لاجرم بر مجرد تذکار، اقتصار نموده، این رباعی حضرت مولانا جامی (قدس سره السامی) را می نویسد و خاموش می شود.

افسوس که وقت کار از دست برفت
ایام وصال یار از دست برفت
در معرض یک دولت ناپاینده
دولت پایدار از دست برفت
دگر منتظر نگارش کیفیت مزاج شریفم

والسلام
«خالد»

نامەی دووەم: ئەم نامەیەش هەر بە زمانی فارسیە و دەقی نامەکەش نامەی پرسە و سەرەخۆشی لە مەلا مەحموودە بە بۆنەی کۆچی دوایی برایەکی بە ناوی مەلا شەمسەدین.

**دەقی نامەکە بە شێوەی خوارەوەیە:**

**گر ریخت گلی ز باغ دولت بر خاک      از باد خزان درخت گل ایمن باد**

از استماع انتقال برادر امجد، ملا شمس الدین به سوی ریاض فردوس برین - بلا شائبه تعارف رسمی - خاطر را غباری، و درون را انکداری به هم رسید و صرف به ملاحظه ی احیای سنت و تذکار حقوق آن به جان مروت به تحریر این دو کلمه مبادرت نمود. و الا در جایی که طبع وقاد و ذهن نقاد آن جناب «مستغنی اللألقاب» باشد مانند ما بینوایان را چه مجال پند و اندرز و چه امکان نصایح و مواعظ است؟ که نسبت به آن قره ی باصره ی ارباب عقول، همه از مقوله اهدای زیره است به اهالی کرمان و امر شورابه و همان بدوی ست به خلیفه بغداد با وجود دجله روان، دیگر امید که ایشان مرحوم و مغفور و آن جناب محفوظ و مسرور باشند. «بمنه» والدعاء

بە خوێندنەوەی ئەم دوو نامەیەی سەرەوە، دوو خاڵی زۆر گرنگ دەتوانین ببینین:

خاڵی یەکەم: مەولانا خالید، لە دەقی هەر دوو نامەکەیدا ڕێزێکی تایبەتی بۆ مەلا مەحمود هەیە، کە تیایدا بە سیفەتەکانی وەک مامۆستا، بەوەفا، وەلی نیعمەت ناوی دەبات و ئەمەش پێگەی زانستی و کەسیی مەلا مەحمود دەردەخات کە کەسایەتییەکی وەک مەولانا خالید بەو سیفەتە باشانە و بە ڕێزێکی زۆروە یادی دەکات.

خاڵی دووەم: نزیکی و پەیوەندی گەرمی ئەم دوو کەسایەتییەیە کە بە ڕوونی لە دەقی نامەکەدا دیارە.

سەبارەت بەوەی کە ئایا ئەم مەلا مەحموودە، هەمان مەلا مەحموودی چلەکێشە کە مەولانا خالید دوو نامەی بۆ نووسیووە، دەتوانین بەم جۆرە لەسەری بدوێین.

ئەوەی کە دیار و ڕوونە، جوانڕۆ سێ مەلا مەحموود ناوی بووە کە ناویان لە مێژوودا ماوەتەوە و خاوەن جێگە و پێگەی زانستی و کۆمەڵایەتی بوون. یەکەمیان مەلا مەحموودی چلەکێش، دووهەم مەلا مەحموودی جوانڕۆیی کە کوڕی مەلا محەمەدی قازی بووە، کە دەکاتە کوڕەزای مەلا مەحموودی چلەکیش و بە ئاغەمەلا بەناوبانگ بووە. مێژووی ژیان و کۆچی دوایی لە نێوان ساڵانی ١٢٤٠ تاکوو ساڵی ١٣١٥ بووە

**مەولانا خالید، لە دەقی دوو نامەیدا ڕێزێکی تایبەتی لە مەلا مەحمود گرتووە، بەشێوەی مامۆستا، بەوەفا، وەلی نیعمەت ناوی دەبات، ئەوەش پێگەی زانستی و کەسیی مەلا مەحمود دەردەخات.**

(میرەحمەدی ۱۳۸۹:۱۲۹). سێیەم مەلا مەحموودی جوانڕۆیی دانیشتووی گوندی دەرەتفێ و مامۆستای حوجرەی بالک بووە کە ساڵی ۱۳۰۰ لە دایکبووە و ساڵی ۱۳۶۳ کۆچی دوایی کردووە. (المدرس ۱۹۸۳:۳۶۵)

بە بەراوردکردنی ساڵی لەدایکبوون و کۆچی دوایی ئەم سێ کەسایەتییە بۆمان دەردەکەوێت کە تەنیا مەلا مەحموودی چلەکێش هاوچەرخی مەولانا خالید بووە، چونکە مەولانا لە نێوان ساڵەکانی ۱۱۹۰- ۱۲۴۲ ژیاوە و ئەو دوو مەلا مەحموودەی تر پاش کۆچی دوایی مەولانا خالید لەدایکبوون. هەربۆیە دەتوانین بەردەنگی ئەم نامەیە بە مەلا مەحموودی چلەکێش بزانین.

سەرەداوێکی هەرە باشیش بۆ سەلماندنی ئەم بابەتە، لە نامەی دووەمدا هێنانی ناوی مەلا شەمسەدین ناوێکە کە برای مەلا مەحموود بووە. لەسەر ئەم بابەتە زۆر خۆم هیلاک کرد و سەردانی دوو گەورە زانای بنەماڵەی فەخریی و قازیزادە یانی مامۆستا مەلا عەلی فەخریی و مامۆستا محەمەدی قازیزادەم لە نزیکەوە کرد، ئەم دوو بەڕێزە هەم تەمەنیان زۆرە و هەم وەک دوو زانای گەورەی جوانڕۆ دێنە ئەژمار کە وەچەی مەلا مەحموودی چلەکێشن، بەداخەوە ئەو هەردوو بەڕێزە وتیان ئاگاداری بوونی براکانی مەلا مەحموود نین، چونکە درەختی بنەماڵەیی ئێمە بەدرێژایی لە مەلا مستەفای بێسارانییەوە دەستپێکردووە، تا گەیشتووەتە مەلا مەحموود و مەلا محەمەدی قازی کوڕی مەلا مەحموود و ناوی براکانی تێدا نییە. هەربۆیە مەلا شەمسەدین ناناسین.

ئەوەی جێگای داخە ئەوەیە کە وەڵامی ئەم نامانەی مەولانا خالید لەلایەن مەلا مەحموودەوە نەدۆزراوەتەوە. خۆ نابێ کەسایەتیەکی وەکوو مەولانا خالید، نامەکانی بێ وەڵام مابێتەوە، لە کۆتایی نامەی یەکەمیشدا، مەولانا خالید، بۆ مەلا مەحموودی نووسیوە کە چاوەڕوانی نامەی مەلا مەحموودە بۆئەوەی لە حاڵ و بارودۆخی ئاگادار بێت. هیوادارم ئەم نامانە بدۆزرێنەوە و چاوی هەمووانی پێ گەش بێتەوە.

## دەقێکی نووسراوی مەلا مەحموود لە بەڵگەنامەی
## پەسەندکردنی نەسەبی کۆسەی هەجێج

بەڵگەنامە نەسەبی شێخ عوبەیدوڵڵا، ناسراو بە کۆسەی هەجێج کە لەلایەن زانایان و فەرمانڕەواکانی ئەو سەردەمەوە پەسەند کراوە. یەکێکە لەو بەڵگانەی کە خەت و مۆری مەلا مەحموودی تێدایە. ئەم بەڵگەنامەیە لە چەند لاپەڕە پێکهاتووە، مێژووی نووسینی ئەم بەڵگەیە دیار نییە، بەڵام لە یەکەم لاپەڕەیدا ساڵی ٤٢٢١کۆچی نووسراوە و دوایین مۆرکردنی شەجەرەکەیش ٣١٣١ کۆچییە. بەپێی ئەو مۆرانەی کە لەسەر بەڵگەکە هەیە پێدەچێ مۆر و نووسراوەکەی مەلا مەحموود لە نێوان ساڵەکانی ٥٢٢١-٠٣٢١ بووبێ. لەم بەڵگەیەدا وەک هەموو بەڵگەنامەکانی تر، هەموو ئەوانەی وا مۆریان کردووە، شتێکیان نووسیوە، مەلا مەحموودیش بە بەراورد لەگەڵ ئەوانی تر، دەقێکی درێژی بە عەرەبی نووسیوە، ئەمەش دەقی نووسراوەکەی مەلا مەحموودە.

لقد تحقق عندي بشهادة الكتب المعتبرة أن السيد عبيد الله دجلة زلال جرت من محيط الكمال وعين فرات سرت من عباب الجلال جوهر وحيد أخرج من كاف الكرامة لؤلؤ فريد أنتج من غين الإمامة، ثمرة من دوحة الزهادة والسعادة شجرة من روضة الشهامة والسيادة أعني أنه ولد صلبي لأعظم الأعاظم حقا وابن حق لمولانا ابي علي الرضا (موسى الكاظم) صدقا. حشرني الله تعالى في زمره محبيه لديه. هذا ما كتبه لاياتيه الباطل من خلفه ولا من بين يديه وأنا الراجي إلى العفو الودود محمود الجوانرودي

لە پەڕاوێزی هەمان نووسراودا محەمەد قەسیمی دانیشتووی سنە، دەقێکی لەسەر نووسراوەکەی مەلا مەحموود نووسیوە. ئەم محەمەد قەسیمە کە دانیشتووی شاری سنە بووە هەمان شێخ محەمەد قەسیمی مەردوخی تەختەییە. پەیوەندی یان ئاشنایی شێخ محەمەد قەسیم و مەلا مەحموودیش دەکرێ خاڵێکی تر بێ بۆ سەلماندنی ئەوەی کە ئەم مەلا مەحموودە، هەمان مەلا مەحموودی چلەکێشە.

ئەم زانای تەختە، مامۆستای مەولانا خالید بووە و ساڵی ٦٣٢١ کۆچی دوایی کردووە (روحانی ٧٩٢:٢٨٣١)، بە بەراوردکردنی لەگەڵ ساڵەکانی ژیانی مەلا مەحموود (٥٥١١-٦٣٢١) بەڕوونی دیارە کە ئەم دوو زانایە هاوچەرخ بوون و هەردووکیان لە یەک ساڵدا کۆچی دواییان کردووە.

لەوێدا ئاماژە بەوە دەکات کە ئەم دەقە، مەلا مەحموودی لە بنەڕەت بێساڕانی و دانیشتووی جوانڕۆ نووسیوویەتی، ئەمە بۆ خۆی باشترین بەڵگەیە بۆئەوەی کە خەت و مۆر و نووسراوەی مەلا مەحموودی چلەکێشی جوانڕۆیی بزانین.

دەقی نووسراوەکەی محەمەد قەسیم لە خوارەوە هاتووە:

هذ الذي كتبه ملا محمود البيساراني الأصل وجوانرودي السكن بعين تدقيق للنظر الحق في أن السيد عبيدالله واحد من أولاد الموسى الكاظم رضي الله عنهم والسلام

وأنا العبد الجاني محمدقسيم السنندجي السكن

واتە»ئەمە مەلا مەحمودی بە بنەڕەت بێسارانی و دانیشتووی جوانڕۆ نووسیویەتی، بە چاوێکی وردبینییەوە، بۆئەوەی ئەو ڕاستییە لەبەرچاو بگرین کە سەید عوبەیدوڵڵا یەکێکە لە کوڕەکانی موسای کازم، خوا لێیان ڕازی بێت.

وە من بەندەی تاوانبار، محەمەد قەسیمی دانیشتووی سنە.

باسی ئەم بەڵگەیەش لە کتێبی «سفرنامه بلوک جوانرود»ی میرزا عەلیخانی ئەردەڵان، ناسراو بە زەفەرولمولک، کە گەشتێکە بۆ جوانڕۆی ئەو سەردەمە هاتووە، ئەم کتێبە بە زمانی فارسییە و لەبارەی ئەم بەڵگەیە وا باس دەکات:

جمعی هجیجی آمده بودند ... طوماری نمودند ممهور به مهر مرحوم امان الله خان والی بزرگ و مرقوم امان الله خان ثانی و حسام السلطنه و معتمدالدوله و مرحوم حسام الملک و مرحوم شرف الملک و جمعی از علمای قدیم هر یک به مضمونی مبنی بر نصب (نسب) حضرت سلطان عبیدالله – علیه السلام – که برادر حضرت امام ضامن امام رضا – علیه السلام – است. اینجانب چون دیدم و خط و مهر این بزرگواران یادگاریست اینجانب هم دو کلمه در گوشه آن طومار نوشتم و مهر کردم: من نمانم ختم بماند یادگار (ظفر الملک ۱۹۳۸:۱۳۳).

واتە: کۆمەڵێک هەجیجی (خەڵکی هەجیج) هاتبوون ... داواکارییەکیان هێنابوو کە بە مۆری خوالێخۆشبوو ئەمانوڵلاخانی والی گەورە نووسراوەیەکی ئەمانوڵلاخانی دووەم، حوسامولسەلتەنە، موعتەمەدولدەولە، خوالێخۆشبوو حوسامولمولک، خوالێخۆشبوو شەرەفوولمولک و کۆمەڵێک زانای کۆن مۆر کرابوو. هەریەکەیان نووسراوێکیان هەبوو لەسەر حەزرەتی سوڵتان عوبەیدوڵڵا – درووودی خوای لەسەر بێت – کە برای حەزرەتی ئیمامی زامن (واتە) ئیمام ڕەزایە. و کاتێک خەت و مۆری ئەو کەسایەتیانەم بینی، منیش دوو وشەم لە گۆشەی پەرتووکەکەدا نووسی و مۆرم کرد.

ئەم گەشتەی محەمەد عەلیخانی ئەردەڵان کە چوار مانگ و چەند ڕۆژی پێچووە لە کۆتاییەکانیساڵی ۱۳۱۲ کۆچی و دەستپێکی ساڵی ۱۳۱۳ بووە. بۆیە پێدەچێت کۆتا مۆری ئەم بەڵگەیە، هەمان مۆری محەمەد عەلیخانی ئەردەڵان بێ. ئەمە ئەوە دەگەیەنێ کە ئەم بەڵگەیە، بەڵگەیەکی بڕوا پێکراوە.

## (تحفة الوزیر) تاکە بەرهەمی بەجێماوی مەلا محموود

تا ئەو جێگایەی کە نووسەری ئەم وتارە لێی ئاگاداربێ تا ئێستا لە هیچ سەرچاوەیەکدا ئاماژە بە بەرهەمی نووسراوی ئەم زاتە نەکراوە. لەم وتارەدا تیشک دەخەینە سەر بەرهەمێکی ئەم زانایە کە بۆ یەکەم جارە دەدرێتە پاڵی مەلا مەحموودی چلەکێشەوە. ناوی ئەم بەرهەمە کە دەستنووسە و هێشتا ساغ نەکراوەتەوە و تەنیا یەک نووسخەیە تحفة الوزیر(توحفەتولوەزیر)ە.

ئەم دەستنووسە بە زمانی فارسییە لە کتێبخانەی «مرکز مطالعات و تحقیقات اسلامی»، واتە ناوەندی توێژینەوە و لێکۆڵینەوەی ئیسلامی شاری قومی ئێران بە ژمارە ٩٧٨/٧ دەپارێزرێ. وەک لە سەرەتایدا  مەلا مەحموود باسی دەکات ئەم کتێبە وەرگێڕاوی فارسی کتێبی «رسالة النجاة من شر الصفات»ی شێخ شەهابەدین ئەحمەد بن مەحموودی سیواسیە کە بە داواکاری میرزا لوتفوڵڵای وەزیر لە ساڵی ٨٠٢١ لەلایەن مەلا مەحموودی جوانڕۆییەوە لە عەرەبییەوە کراوە بە فارسی و بە میرزا لوتفوڵڵای ناوبراو خەڵات کراوە، هەربۆیە مەلا مەحموود ئەم کتێبەی ناو ناوە توحفەتولوەزیر. ئەم کتێبە لەسەر بابەتی خواناسی و سۆفیگەرییە.

لە پێرستیی دەستنووسەکانی ئەم کتێبخانەیەدا و لە بەشی ساڵی نووسیندا، ساڵی ٣٩٢١ تۆمار کراوە و لە بەشی پێشەکیدا ساڵی ٨٠٢١ وەک ساڵی وەرگێڕان و نووسینی ئەم بەرهەمە دیاری کراوە. ئەمە لەکاتێکدایە کە ئەم دوو ڕێکەوتە بە هەڵە تۆمارکراون، چونکە ئەو ڕێکەوتە کە ئاماژەی پێکراوە  و بە پیت نووسراوە و بەڕوونی لە لاپەڕەی یەکەمی دەستنووسەکەدا نووسراوە ساڵی   ٨٢٢١ کۆچییە. هەر بەپێی ئەم ساڵە دەتوانین ئەم دەستنووسە بە بەرهەمی مەلا مەحموودی چلەکێشی جوانڕۆیی بزانین. لە کۆتایی ئەم وتارەدا وێنەی لاپەڕەی سەرەتایی ئەم دەستنووسە دادەنرێت.

خاڵێکی تر بۆ سەلماندنی ئەوەی کە نووسەری بەڵگەکەی شێخ عوبەیدوڵڵای هەجێج و کتێبی توحفەتولوەزیر، یەک کەس بووە ئەوەیە کە لە دوو دەستنووسی ناوبراودا مەلا مەحموود پێش هێنانی ناوی خۆی وشەی «الودودی» هێناوە کە یای کۆتایی ئەم وشەیە دەکرێ بۆ تەعزیم واتە گەورە زانین بەکاری هێنابێ یان وەک سەروادار (سەجع).

ئەمەی وا پێشکەش کرا، چەند لایەنێکی نەوتراو لەسەر ژیان و بەرهەمی مەلا مەحموودی چلەکێشی جوانڕۆیی بووە کە بەپێ توانای خۆمان هەوڵماندا پێشکەشی خوێنەرانی بکەین، هیوادارم لە داهاتوودا سەرەداوی زیاترمان بۆ زیاتر ناساندنی ئەم زانا پایەبەرزە دەستبکەوێت.

## وێنەی لاپەڕەی یەکەمی دەستنووسی «تحفة الوزیر»ی
## مەلا محموودی چلەکێشی جوانڕۆیی



## وێنەی نووسراوەکەی مەلا مەحموود و شێخ محەمەدقەسیمی تەختە



## سەرچاوەکان


١. حسین زاده آیشه دولی، محمد (٧٧٣١)، تاریخچه جوانرود، چاپ اول، کرمانشاه، انتشارات طاق بستان.

٢. روحانی، بابامردوخ (٠٩٣١). تاریخ مشاهیر کرد، جلد اول، چاپ سوم، تهران، انتشارات سروش.

٣. سلطانی، محمدعلی (٤٧٣١)، تاریخ تسنن در کرمانشاه، تهران، نشر سها.

٤. ظفر الملک، محمدعلیخان اردلان (٨٩٣١). سفرنامه بلوک جوانرود، سال های ٢١٣١ و٣١٣١ قمری، تصحیح: عبدلی ، محمد، مهاباد، نشر میراث مانا.

٥. القرهداغي، محمدعلی (٦١٠٢)، مکتوبات مولانا خالد النقشبندي، الطبعة الأولی، مرکز آرا للإعلام.

٦. المدرس، عبدالكريم (٣٨٩١)، علماءنا في خدمة العلم والدين، ط ١، بغداد، دارالحرية للطباعة.

٧. میراحمدی، فریدون (٩٨٣١)، جوانرود در گذر تاریخ، سنندج، نشر سنندج.

٨. مەولەوی تاوگۆزی، عەبدولڕەحیم، (٦٨٣١)، دیوانی مەولەوی کورد، ئامادەکردنی: مودەڕیس، عەبدولکەریم، چاپی چوارەم، سنە، بڵاوگەی کوردستان.

٩. ناطقی، علی اوسط و همکاران (٦٨٣١). فهرست نسخه های خطی کتابخانه مرکز مطالعات و تحقیقات اسلامی، جلد ٢، قم، نشر بوستان کتاب.


## دیدەنی تایبەت


- دیدەنی لەگەڵ مامۆستا مەلا ئەحمەدی فەخری، جوانڕۆ، مانگی پووشپەڕی ساڵی١٠٤١ی کۆچیی هەتاوی.

- دیدەنی لەگەڵ مامۆستا محەمەدی قازیزادە، جوانڕۆ، مانگی پووشپەڕی ساڵی١٠٤١ی کۆچیی هەتاوی.



**پ.د.کەماڵ صادق یاسین لەك**
**کولێژی زانستە ئیسلامییەکان / زانکۆی سەڵاحەدین / هەولێر**

# ئاستەنگەکانی خوێندنی ئایینی چارەسەر و پێشنیاز

ئاینی پیرۆزی ئیسلام لە زۆربەی شوێن و وڵاتاندا سەرەتا بە فەزڵی خودای گەورە و دواتر بەهۆی ئەو مزگەوت و قوتابخانە ئاینییانەوە بەزیندوویی ماوەتەوە، ئەگەر ئەو قوتابخانە ئاینییانە نەبوونایە ئیسلام لە زۆر شوێن دەسڕایەوە، خۆ ئەگەر نەشسڕابایەوە ئەوا وێنەیەکی شێواوی ئیسلام دروست دەبوو جیاواز لە ڕاست و دروستی ئاینی پیرۆزی ئیسلام و بەم شێوەیە تەشەنەی نەدەکرد. دەبێت ئەوە بزانین کە هەموو گەلانی موسڵمان بەجیاوازی پلە و پێگەی کۆمەڵایەتییان پشتگیری قوتابخانە ئاینییەکانن و لەپشتیان دەوەستن، و هەر کەسێك کەمێك ڕوو لە ئایین بێت خۆشەویستی و ڕێزی لە دڵدا هەیە بۆ قوتابخانە ئاینییەکان و مزگەوتەکان بەشێوەیەکی گشتی.

دیاره شتێکی بەڵگەنەویستە لە سەردەمی حوکمی خەلافەتی ئیسلامی خوێندنی ئایینی ڕێز و پلەوپایەی تایبەتی خۆی هەبووە لە سەرجەم هەرێم و وڵاتە ئیسلامییەکان، بەڵام لە دوای ڕووخانی خەلافەتی ئیسلامی ڕووبەڕووی کێشە و ئاستەنگی زۆر بووەتەوە، لە ساڵی ١٩٢٤ موستەفا کەمال ئەتاتورک یاسای دەرکرد بۆ هەڵوەشاندنەوەی خوێندنی ئایینی، هەربۆیە خوێندنی ئاینی لە حوجرە و مزگەوتەکان قەدەغە کرا، هەروەها دادگا شەرعییەکان هەڵوەشاندرایەوە، پۆشاک و جلی حیجاب و جوبە و مێزەرە قەدەغەکرا، لەسەرکردنی شەبقە فەرزکرا، لەبەرکردنی پۆشاکی تایبەتی زانایانی ئایینی لە دەرەوەی مزگەوت قەدەغەکرا و تەنها لەناو مزگەوت و کاتی نوێژکردن ڕێگەی پێدرا، گرێبەستی هاوسەرگیری مامۆستایانی ئایینی گۆڕدرا بە تۆمارکردنی لە دادگای مەدەنی، هەروەها کارکردن بە ساڵنامەی کۆچی قەدەغەکرا و کارکردن بەساڵنامەی زایینی فەرزکرا، قسە و نووسین بەزمانی تورکی فەرزکرا لە سەرتاسەری تورکیا، پشووی هەفتانە لە ڕۆژی هەینییەوە کرا بە ڕۆژی یەکشەممە، سڵاوکردن لە وشە و دەم گۆڕدرا بەئاماژەی دەست و تەوقەکردن، یاساکانی شەریعەتی خیلافەی عوسمانی کە بریتی بوون لە (گۆڤاری یاسا دادگەرییەکان= مجله الأحكام العدلية) گۆڕدرا بە یاسای سویسری، بەکارهێنانی پیتی عەرەبی قەدەغەکرا و گۆڕدرا بەپیتی لاتینی، وشەکانی بانگ دان لە زمانی عەرەبی گۆڕدرا بۆ زمانی تورکی. لە ساڵی ١٩٣١ قورئان بەزمانی عەرەبی قەدەغەکرا لەجیاتی ئەوە تەرجەمە کرا بۆ زمانی تورکی و لە مزگەوتەکان دابەشکرا، ئاهەنگێڕان بە هەردوو جەژنی ڕەمەزان و قوربان قەدەغە کرا، یاسای میرات دابەشکردن دەستکاری کرا...هتد.

بەڕاستی لەوکاتەوە خوێندنی ئایینی کەوتە قەیران و ئاستەنگەوە، وەک دکتۆر (سهير أحمد السكرى) پسپۆری زمانەوانی لە زانکۆی جورج تاون دەڵێت:» بەڕاستی ئینگلیز و فەڕەنسییەکان گەیشتنە ئەو باوەڕەی کە جەنگ لەگەڵ مسوڵمانان پێویستە لەناو قوتابخانە و خوێندنگا و پرۆگرامی خوێندنەوە دەستپێ بکات بەلەناوبردن و لاوازکردنی خوێندنی ئایینی، بەکردنەوەی قوتابخانە بیانییەکان بە زمانی ڕۆژئاوایی لە هەموو وڵاتە عەرەبی و ئیسلامییەکان، لەگەڵ دژایەتی کردنی زمانی عەرەبی، هەروەها سەرفکردنی پارەی خەیاڵی زۆر بۆ خوێندن بە زمانی بیانی و گرنگیدان بە پێشکەوتن و تەکنۆلۆژیای سەردەم، لەگەڵ بەخشینی یارمەتی ماددیی و دابینکردنی هەلی کارکردن و دامەزراندن بۆ مامۆستا و خوێندکارانی دەرچووی ئەم قوتابخانە بیانیانە«. (فتاوى الشبكة الإسلامية ١/ ٥٦٠٧، المكتبة الشاملة).

دەربارەی قوتابخانە ئاینییەکان لە کوردستان شتێکی ئاشکرا و بەڵگە نەویستە کە خوێندن لە کوردەواریدا پێش پەیدابوونی خوێندنی فەرمی حکومی تەنها لە مزگەوت و

حوجرەکان هەبوو، هەربۆیە ئەوکات حوجرەی مزگەوتەکان تاکە مەڵبەند و سەرچاوەی پێگەیاندنی زانا و ئەدیب و ڕۆشنبیران بووە، هەربۆیە زۆربەی شاعیرەکان دەرچووی حوجرە و قوتابخانە ئاینییەکان بوونە و هەستی ئاینی و نەتەوایەتیان هەبووە، بۆیە بەدڵنیاییەوە دەتوانین بڵێین: زانا و مەدرەسە ئاینییەکان ڕۆڵی گەورەیان لە کوردستاندا بینیوە و بوونەتە ناوەندێکی بەهێزی دەسەڵاتی کۆمەڵایەتی، ئەمەش وایکردووە کاریگەری زانایانی ئاینی لەسەر سەرۆک هۆزەکان زۆر بێت، لە ئەنجامدا ڕۆڵێکی سەرکەوتوویان بینیوە لە چارەسەرکردنی کێشەی نێوان هۆزەکان.

پێشتر لە کۆمەڵگای کوردی لە سەرجەم کوردستان خەڵکی نەریتی وابوو منداڵی دەنارده حوجرەی مزگەوت و لەلای مەلا دەرسی قورئان و چەند کتێبێکی دەخوێند، هەریەکێک بیویستایە منداڵەکەی بنێرێتە بەر خوێندن دەچووە لای مامۆستای مزگەوت و پێی دەگوت: قوربان ئەگەر گەورەیی بکەی دەمەوێ کوڕەکەم لە خزمەتتدابێ و قورئان خەتم بکات، مەلاکەش ڕەزامەندی دەردەبڕی. دەربارەی دیاریکردنی تەمەنی فەقێ و خستنە بەر خوێندنی ئاینیی هیچ ساڵێکی دیاریکراو دانەنرابوو بۆ چوونە بەر خوێندنی مزگەوت بۆ منداڵان، بەڵام بەگشتی ئەو فێرخوازانەی دەخرانە بەر خوێندنی مزگەوت دەبوو ئەوانە بن کە ئارەزوویان هەیە و تەمەنیان لە نێوان (٧-١٠) ساڵدا بوو، خوێندنیش لە هەموو قۆناغەکانی حوجرە بەخۆڕایی و بێ بەرامبەر بووە. (مێژوی ئەدەبی کوردی، سەجادی، ل٣٤٥).

یەکێک لە تایبەتمەندییەکانی خوێندنی ئاینی لە کوردستان ئازادی خوێندن بووە، چونکە خوێندن لە حوجرەدا ئازاد بووە، واتە: بەپێی یاسایەکی دانراو لەلایەن دەوڵەتەوە بۆ ڕەوتی خوێندن نەبووە، وێڕای مەلای وانەبێژی حوجرە نە حکومەت نە ئەو کۆمەڵە کە خەرجی کێشاوە خۆی نەکردووە بە خاوەنی، بەڵام کۆمەڵێک دابونەریتی تایبەت بەخۆی هەبووە وەکو یاسایەکی نەنووسراو بوونە، دەبوو لەبەرچاوبگیرێن و جێبەجێ بکرێن. هەڵکشانی خوێندن لە حوجرەدا بەپێی قۆناغ بە قۆناغی گەشەپێدانی بایلۆژی منداڵان دانەنراوە، ئەویش جۆرە ئازادییەکی تێدا هەبووە، بەڵام زۆرجار لە بەرژەوەندی فەقێی خوێندکار نەبووە، چونکە یاسای پلیکاندن (التدرج ) ی تیا نەبووە، بەپێی ئەو کتێبانە بووە کە بەیەکەوە لە دوای یەک جێگربوونە و لەجێی خۆیان نەترازاون کەسیش بیری لە سووک و قورسی و گونجاویی و نەگونجاویان لە ئاست توانای فەقێیاندا نەکردووەتەوە، ئیتر خوێندنیان بە هیچ یاسایەکەوە نەبەسترابوو.

مێژووی هاتنی هەر ماددەیەک بۆ ناو خوێندنی حوجرەکەی بووبێ لە پێش کام ماددەوە هاتبێ یان پاش کام زانستەوە بووە هەروەها ماوەتەوە، گرنگە ئەوەبڵێین:

زانستی ڕێزمان و مۆرفۆلۆژی – نەحو و صەرف) لە سەرتاوە بنەمای حوجرەیان لەسەر دامەزرا و تائێستاش شوێنی خۆیان بەرنەداوە. خوێندنی حوجرە خوێندنی بە کۆمەڵ نییە، بەڵکو زیاتر تاکە کەسییە، ئەمە بووە هۆی ئەوەی ئازادی تەواو بدا بە فەقێ و بە ئارەزووی خۆی بێ، چی بخوێنێ و لەلای کام مامۆستا حەز بکات یان حەز نەکات بخوێنێ سەرپشک بووە. ماوەی دەرسەکە درێژ بێت یا کورت، حەقی کەس نەبووە قەدەغەی بکات، ئەو کتێبەی کە دەستی بە خوێندنی دەکرد، بە ئارەزووی خۆی بووە کەی تەواوی بکات یان نەیکات، هەبووە پەلەی لە تەواوکردنیدا نەکردووە، هەشبووە حەزی کردووە زوو تەواوی بکات. ئەوەی زیرەک بووبێ وەکو فەقێی نازیرەک نەبووە، حەزی کردووە ڕۆژانە چەند بابەتێکی کتێبەکەی بخوێنێ و بڕوا، هەشبووە هەنگاوی کیسەڵانەی ناوە و خۆی تیاماندوو نەکردووە، بەڵام بەشێوەیەکی تێکڕایی پەلەکردن لە تەواوکردنی کتێبەکانیاندا شتێکی پەسەند نەبووە، فەقێی وا هەبووە دووجار لای دوو مەلای جیاواز یەک کتێبی لە سەرەتاوە تاکۆتایی خوێندووەتەوە، فەقێی واش هەبووە، لەبەر فرەبابەتی و درێژەپێدانی کتێبەکە لێی هەراسان بووە و بەر لە کۆتایی هاتنی چووەتە سەر ئەو کتێبەی کە لە پاش ئەودا نۆبەی خوێندنی هاتووە. لەبەرئەوەی لەناو فەقێیاندا هەمیشە پرسیار و گفتوگۆ لەسەر بابەتە قورسەکان کراوە، هەربۆیە دەبوو فەقێ ئاگاداری ئەو بابەتانە بن کە دەرخیان دەکردن، پرسیارکردنەکە لەسەر بابەتی سەرتاسەری نەدەکرا، بەڵکو هەڵهێنانی عیبارەتێک بوو یان ئیعرابکردنی ڕستەیەک بوو، یان هەندێ جار مامۆستا کە دەرسی بە فەقێکەی دەگووت هەندێ پرسیاری وەها دەهاتنە پێشەوە پەیوەندییان بە کتێبی پێشەوەی ئەو کتێبەوە هەبوو کە دەیخوێند، ئەگەر فەقێکە نەیزانیبایە مامۆستاکەی لێی دەکەوتە گومان و دڵی لێی کرمێ دەبوو، بەوە دەیزانی کە نەیخوێندووە، بەڵام لەبەر نیەت پاکی و دڵسۆزیی و ئەمانەتی عیلمی زۆر کەم ڕووی داوە فەقێ ئەو فێڵە لە خوێندنی خۆی بکات، ئەوەی ڕاستی بێ: ڕەوشت باشی و ڕاستڕەوی و ویژدانداری مامۆستای ئایینی و ئەهلی مزگەوت و لەخواترسان ڕێیان نەداوە فرت و فێڵ لە بواری خوێندندا هەبێت.

یەکێکی تر لە تایبەتمەندییەکانی  خوێندنی ئایینی لە کوردستان ئەوەیە کە دەرگای حوجرە کراوە بووە بۆ هەمووان و خوێندنی مزگەوت تایبەت نەبووە بە هیچ چین و توێژێکی ناو کۆمەڵ، بۆ هەمووان بووە و هەمیشە دەرگای کراوە بووە بۆ هەرکەسێک یان بۆ منداڵی هەر خێزانێک کە ویستبێتی بخوێنێ و بەدوای بەدەستهێنانی ئەو زانستانەی حوجرەدا بگەڕێ و بەرەنج و کۆششی خۆی بگاتە پایەی مەلای دوانزە عیلمەکە لەناو کۆمەڵدا لە هەموو کەسێ بەڕێزتر بووە. دەبێ ئەوەش بزانین بەدەستهێنانی خوێندنی

**دەرگای حوجرە کراوە بووە بۆ هەمووان و خوێندنی مزگەوت تایبەت نەبووە بە هیچ چین و توێژێکی ناو کۆمەڵ.**

دوانزە عیلم  بە ئاسانی دەستنەکەوتووە، زەحمەت و هەوڵ و تێکۆشانی پڕ لە ئیش و ئازار و غەریبی و ماندووبوونی ساڵانی زۆری تەمەنی ویستووە، فەقێ لە پێناویدا هەموو قۆناغەکانی لاوێتی خۆی تیا تواندووەتەوە و ساڵەهای ساڵ بەدوای بەدەستهێنانیدا ئاوارە بووە لەبەرئەوەی ئەو خوێندنە بە ئاسانی بەرهەم نەهاتووە تەنیا منداڵە هەژار و نەداران توانیویانە بەو ئاواتە بگەن و ئەو خوێندنە بەدەست بهێنن، ئەوە ئەوەمان بۆ دەردەخات کە بۆچی گەورە زانایان و هزرڤانان و مەلا گەورە و (مجتهد)ەکانی پێشوو هەموویان لە چینی هەژاران و نەداران هەڵکەوتوون.  (خورجەیەک لە فۆرکلۆری دەشتی هەولێر، عەزیزی مەلای ڕەش، ص٢٤٠).

جا لێرەدا سەرباری هەبوونی لاوازی لە قوتابخانە ئایینییەکان و مەنهەجەکانیان، بەڵام نابێتە زیادەڕەوی ئەگەر بڵێین: قوتابخانە ئاینییەکان ڕاگری دروشم و چرای ئایینی پیرۆزی ئیسلامن، پارێزەری شکۆی ئیسلام بوون بەهۆی ئەو ئەستێرە و زانا پرشگندارانەی کە تێیدا دەرچوون و بەرگری و داکۆکیان کردووە لە بیروباوەڕ و عەقیدەی مسوڵمانان، ڕەوشتی بەرزی کۆمەڵگەی کوردی بەهۆی ئەو قوتابخانە ئاینییانە بەزیندوویی ماوەتەوە، ئەگەر ئەو قوتابخانە ئاینییانە نەبوونایە خەڵک سەری لێ دەشێوا و گومڕا دەبوو، ئەم قوتابخانانە وەک قەڵایەکی سەخت بوون لە بەرگری کردن لە ئایینی پیرۆزی ئیسلام بەدرێژایی مێژوو، بەڵام لەهەمانکاتدا دەبێ ئەو ڕاستییە بزانین کە چەندین قەیران دەوری خوێندنی ئاینییان داوە و کرچ وکاڵی زۆریش هەبووە لە بەرامبەردا، ئەو مەنهج و پڕۆگرامانەی دانراوە لە زۆربەی وڵاتە ئیسلامییەکان ناتوانێ زانا و بانگخواز وتاربێژی سەرکەتوو بەرهەم بهێنێت، ئاستەنگ و کێشەکانی خوێندنی ئایینی زۆرن، دیارترینیان ئەمانەی خوارەوەن:

١. تاوانبارکردنی خوێندنی ئایینی بەهۆکاری دروستبوونی قەیرانی سیاسی، داهێنانی توندوتیژی و توندڕەوی، تەنانەت هەندێک لە بەناو نوسەر و سیاسییەکان

داوای بنبڕکردنی قوتابخانە و خوێندنگە ئیسلامییەکانیان کردووە، هەروەها هەوڵی دەستوەردانی خێرایان کردووە لە مەنهەج و کۆرسەکانی خوێندنگە ئاینییەکان لە زۆر شوێن، بە بەهانەی بنبڕکردنی توندڕەویی و وشککردنی سەرچاوەکانی، کە ئەوە قەیران و ڕووبەڕووبوونەوەیەکی زۆر مەزنە و پێویستی بە چارەسەر هەیە.

٢. سەرباری هەبوونی ژمارەیەکی زۆر لە خوێندنگە و پەیمانگا و زانکۆ ئاینییەکان وەک جێگرەوەی خوێندنی حوجرە، بەڵام بەداخەوە ئاستی زۆرینەی دەرچووانیان ناگەن بەئاستی تەنانەت فەقێیەکی حوجرەکان، چ جای دروستکردن و دەرچوواندنی زانا و موجتەهید بۆ چارەسەرکردنی کێشەکانی ئوممەت، لەو لاشەوە دەرچووانی خوێندنی حوجرە بێ بەشن لە کار و پلەوپایە و دامەزراندن، لەبەر نەبوونی بڕوانامەی پەیمانگا و کۆلێژە ئەکادیمییەکان، کە دەرچووانیان پلەوپایەی زۆر وەردەگرن، ئەگەرچی لەڕووی زانستییەوە نەخوێندەواریش بن.

٣.گرنگیدان تەنها بەوانە ئاینییەکان، و بێ بەها کردنی زانستەکانی تر، و بەردەوام بوون لە وتنەوەی مەنهەجی کۆن کە تێیدا گرنگی زۆر زۆر دراوە بە چەند زانستێک وەکو زانستی( نەحو، صەرف، لۆژیک –مەنتیق –، فەلسەفە، علم الکلام) بەبێ دیاریکردنی پێگەی شایەن بە قورئانی مەزن  و سوننەی پیرۆز، ئەم ڕاستییە جەنابی مەلای گەورە –ڕەحمەتی خوای لێبێ–ئاماژەی پێکردووە کە دەفەرمووێ:

**دەزانی ناوی عـــەردی چـــی تێدایە؟**
**وەلێ وەرقومی ئەمـــری کـــیمیایە**
**هەتاکو ئەو عیلمە زۆر چاک نەخوێنن**
**دەبێ هــەر پاقلــە و ســـڵقان بچێنن**
**عیلمی تەبیـــعەت عیلمـــی خـــوایە**
**قالە و قەوەلـــــە گشتی هــەبایــە**
**عیلمی کیـــــمیات گەر نەخوێندووە**
**بەخـــــوا نازانی خوا چی کردووە**

ئەوەش ئاسۆی بیری ڕۆشنی مەلای گەورە دەردەخات کە ئامۆژگاری نەتەوەکەی دەکات بەتایبەتی خوێندەوارەکان، کە بیر بکەنەوە و بزانن کەژێر خاکی ئەم نیشتیمانە هەمووی کانگا و سەرچاوەی گەوهەر و گەنجینەن، بزانن چۆنی دەردەهێنن و چۆنی کەڵک لێ وەردەگرن بەپشت بەستن بە زانیاری سەردەم.

هەروەها دەفەرموێت:

**بڵێنە سیــــبەوەیهی و مازەنی و خـــالەوەیهی**
**کانی نەفتین لەکیس چوو بەڕیشی نەفتەوەیهی**
**ئەتوخوا پێم بڵێ مامۆستای ڕووت و برســـی**
**هیچ ئیشی تۆ پێکدێنێ شیعری ئیمرئول قەیسی**

دیارە مەبەستی مەلای گەورە کەمکردنەوەی ڕێز و گرنگی زانستی نەحو صەرف و زانایانی ناوبراو نیە، بەڵکو مەبەستی قوڵ بوونەوە و زیادەڕەوی کردنە لە فێربوونی ئەم زانستانە، چونکە وەسیلە و ئامراز و هۆکارن نەک مەبەست و غایەت، لەجیاتی درێژەدانیش بەو زانستانە زانستی زۆر پێویست هەیە نابێت فەرامۆش بکرێت. (دیاری مەلای گەورە، ل٨).

هەروەها دەفەرموویێت:

**خۆزێ ئیمامی ڕازی لەم عەسرە زیندووبایە**
**لە سەنعەتی بەشەری تەیــــیارەی بدیبایە**
**ئەمجا ئیمانی دێنا بە قودرەتی بەشــــەری**
**قەت ئینکاری نەدەکرد بە تەقلیدی ئەشعەری**

لێرەدا مەبەستی مەلای گەورە تانەو تەشەر نیە لەو زانا مەزنانە و کەمکردنەوەی قەدر و ڕێزیان، بەڵکو مەبەستی ئەوەیە کە زۆر ڕۆچوون لە عیلمی فەلسەفە و کەلام و جەدەل ئاکامی باشی نابێت، بەڵکو ئیماندار دەبێ عەقیدە و بیروباوەڕێکی پاک و پوختەی هەبێت بەخوای گەورە دروستکەری ئەم بونەوەرە لەگەڵ سەرجەم پایەکانی و ئیسلام و ئیمان بەتێگەیشتنێکی ئاسان دوور لە شەڕە قسە و گفتوگۆی بێ ئەنجام.

٤. کپبوونی خوێندنی ئایینی لەبەر گرنگی نەدان بە هاوتەریب بوون لەگەڵ پێداویستیەکانی سەردەم، چونکە خوێندنەکە لە بوار و کەشێکی تەنها و جیاکراودا دەژی، جیا لەو کەشە سەردەمییەی دەوری داوە بەتایبەت لە هەندێک وڵاتدا، هۆکارەکەشی دەگەڕێتەوە بۆ زیادەڕەویی و ڕۆچوون لە خوێندنی چەند زانستێکی دیاریکراودا و فەرامۆشکردنی زانستە سەردەمییە نوێیەکان.

٥. هۆکارێکی تر بەشێک لە تەوژمی دژە ئایین و نۆکەری داگیرکەران قوتابخانە ئایینییەکان بەدواکەوتوویی و کۆنەپەرست وێنا دەکەن و واپیشان دەدەن کە بوونی ئەم قوتابخانانە هۆکارێکە بۆ بەدەستنەهێنانی مافی گەلی کورد و نەگەیشتن بە ئاواتەکانی. (د.جواد فقی علی، مەلای گەورە، ص٤٥).

٦. هەندێک لە دەرچوانی حوجرە و قوتابخانە ئایینییەکان ئیجازەی عیلمی وەردەگرن بەماوەیەکی کەم و ئاستی زانستیان زۆر لاوازە بەداخەوە، هۆکارەکەشی نەبوونی

تاقیکرنەوەیە لەکۆتاییدا بەبێ هەڵسەنگاندنی تەواو ئیجازەی پێ دەبەخشرێ، زۆر جاران لەسەر داوای قوتابی و بڕیاری مامۆستاکەیە، فەقێ و خوێندکار هیچ تاقیکردنەوەیەکی هەفتانە و مانگانە و ساڵانە ناکرێت بەدرێژایی خوێندنەکەی، تەنها پرسیاری ناو دەرس خوێندن نەبێت، هەربۆیە کاتی خۆی مامۆستا مەلا عەبدولمەجید شەقڵاوەیی –ڕەحمەتی خوای لێبێت – دەیفەرموو: من پێم خۆشە بە هەموو توانام یارمەتی هەموو مسوڵمانان بدەم شەفاعەت و تکایان بۆ بکەم بۆ ئاسان کردنی کاروباریان، بەڵام تەنها دوو بابەت نەبێت:

١.پێدانی مۆڵەتی شوفێری بۆ کەسێک کە شارەزا و شایستە نەبێت.

٢.پێدانی بڕوانامەی زانستی بۆ قوتابییەک کە شایستە نەبێت.

بەڵێ بەڕاستی مامۆستا ڕاستی فەرمووە، چونکە ئەم بابەتە زۆر ناسک و هەستیار و مەترسیدارە، یەکەمیان پەیوەندی بە ڕۆح و گیانی خەڵکەوە هەیە، دووەمیان: پەیوەندی بە دوارۆژ و قیامەتی خەڵکەوە هەیە.

لێرەدا دەتوانین کێشە و قەیرانەکانی خوێندنی ئایینی بەشێوەکی گشتی لەم چەند خاڵەدا ببینینەوە:

أ. لاوازی لە ئامادەکردنی مامۆستایانی شیاو و لێهاتوو بۆ خوێندنگە ئاینیەکان بەگشتی.

ب. لاوازی مەنهەجی خوێندن، تەنانەت نەبوونی لە هەندێک لە خوێندنگەکاندا، یان پشتبەستن بە مەنهەجێکی کۆنی تەقلیدی هاوردەکراو لە وڵاتێکی ئیسلامی تر و نەگونجانی لەگەڵ ئاستی خوێندکاران و نەریتە کۆمەڵایەتییەکان، لەبەرئەوەی ئەو مەنهەجە داڕێژراوە بۆ کۆمەڵگەیەکی ئیسلامی تایبەت و خاوەن ژینگەیەکی جیاواز .

ج. لاوازی بەڕێوەبردن و ئیدارەدان لە خوێندنگە ئاینییەکان لەبەر نەبوونی بەڕێوەبەرێکی شیاو و بەتوانا و ستافێکی شارەزا لە جێبەجێکردنی ئامانجە باڵاکانی خوێندنگا.

د. نەبوونی پلانی تۆکمەی دیراسەت کراو، و دەرکەوتنی دیاردەی هەڕەمەکی لە بڕیارەکانی زۆربەی  ئیدارەی خوێندنگە ئایینیەکاندا.

ە. نەبوونی هیچ هەماهەنگییەک لە نێوان زۆربەی خوێندنگە ئاینییەکان و حکومەت لە زۆر شوێندا، ئەگەرچی لەڕاستیدا هەردوولا تەواوکەری یەکترن و جوتێکن لەناو یەک سنووردا.

و. کەمی سەرچاوەی دارایی لە خوێندنگە ئاینییەکان، پشتبەستنی زۆرینەیان بە بەخشینی ڕاستەوخۆی باوکان و چاکەکار و خێرخوازەکان.

ز. بەکارنەهێنانی هۆکار و ئامرازی نوێ و تەکنۆلۆژیای سەردەم بۆ خوێندنی ئایینی.

ح.کێشەی فێربوونی زمانی عەرەبی لەو وڵاتانەی کە عەرەب نین و فێربوونی یاسا و ڕێساکانی زمانەوانی وەک: (نحو وصرف) بەر لە فێربوونی واتای وشەکانیان.

گ.نەبوونی خوێندنی قۆناغی سەرەتایی ئایینی لە زۆربەی وڵاتانی ئیسلامی و بەفیڕۆدانی

کاتێکی زۆری قوتابی لە سەرەتاکانی تەمەنییەوە بەخوێندنی زانستێک کە بەهیچ جۆرێک کەڵکیان نابێت بۆ تایبەتمەندی و پسپۆڕییەکەی لە زانستە شەرعییەکان.

ی.گرفتێکی تر ئەوەیە: قوتابی خوێندنی ئایینی لە کۆلێژی ئاینییەکان هیچ پێشینەی زانستی ئایینی نیە، بۆ نموونە ١٢ ساڵ خەریکی خوێندنی بەشی ئەدەبییە یان زانستییە پاشان بۆ خوێندنی زانکۆ ڕاستەوخۆ داوا پێشکەش دەکات کە لە کۆلێژی زانستە ئیسلامییەکان وەربگرێت، زۆرجاریش ئاستی نمرەی کەم و نزمە لە کۆلێژەکانی تر وەرناگیرێت، و حەزیش ناکات بچێتە پەیمانگا لەبەر ئاستی بڕوانامە، و بەداخەوە نمرەی کەم دانراوە بۆ وەرگرتن لە کۆلێژی زانستە ئیسلامییەکان، هەربۆیە ئەو قوتابییە تووشی بێتاقەتی و زەحمەتی زۆر دەبێت لە قۆناغەکانی خوێندنی ئایینی، چونکە پێشینەی زانستی ئایینی نیە.

ک.لاوازبوونی پاڵنەری ئایینی و ونبوون لەناو تام وچێژی دونیا و پشتگوێ خستنی لایەنی ڕۆحی و ئیمانی لەلایەن ئوممەت بەگشتی لە کێشە هەرە بنچینەیکانی لاوازبوونی خوێندنی ئاینییە.

بۆ پێداچونەوەی مەنهەجی خوێندنگا ئایینیەکان دەبێت کار بکرێت لەسەر سێ (بنەما):

بنەمای یەکەم: پێداچونەوە و چاکسازی بکرێت لە سەرجەم قوناغەکانی خوێندنی ئایینی وازهێنان لە شێوازی تەلقینی کۆن (لەگەڵ هەبونی چەندین خاڵی ئیجابی)، چونکە پرۆگرامەکان زۆربەیان تەنها کۆکردنەوەی زۆرترین کتێب و زانیاری لە ڕێگای لەبەرکردن بەبێ ڕەچاوکردنی ئاست و تێگەیشتنی فێرخوازەکان.

بنەمای دووەم: بەرەوپێشبردنی ئەو پرۆگرامانەی کە ئێستا دەخوێنرێن، نەک بەمەبەستی گۆڕین و لابردنی دەقەکان و بنەما جێگیرەکانی قورئانی بەڕێز و فەرمایشتە پیرۆزەکان، بەڵکو پرۆگرامێک بێت سەرچاوە کۆنە ڕەسەنەکان و زانستەتازەکان پێکەوە گرێ بدات وەکو دەڵێن:(الجمع بين الأصالة والمعاصرة).

بنەمای سێیەم: قەناعەت بهێنرێت بە سیاسییەکاربەدەستەکان کە خوێندنی زانستە ئیسلامییەکان بە قوڵی و لە سەرچاوە ڕەسەنەکەی خۆیدا کە قورئان و سوننەتە و لەسەر دەستی مامۆستا دیار و ناسراوەکان و شارەزاکان دیاردەی توندڕەوی لاواز دەکات و بنبڕی دەکات، هەرگیز خوێندنی ئایینی مەترسی نییە بۆ سەر ئاسایشی نەتەوەیی و حوکمڕانی وڵات و ماف و ئایندەی گەلەکەمان، بەڵکو خوێندنی ئایینی ئەگەر بە کرچوکاڵی و بەسوکی ( سطحی) خوێنرا لەلای خەڵکانی نەشارەزا و بێ ئاگا لە مەبەستگەرایی بنەماکانی شەریعە (مقاصد الشريعة) و بەبێ وردەکاری ئەو کات لەوانەیە ڕێگا خۆشکەربێت بۆ سەرهەڵدانی بیری چەوت و توندڕەوی و پەڕگیری.

## چارەسەر و پێشنیازەکان:

١. تۆمارکردنی خوێندنگە ئاینییەکان لەلایەن دەزگا فەرمییەکانی وڵات، و ڕێگەنەدان بە دامەزراندنی هیچ خوێندنگەیەک بەبێ ڕەزامەندی پێشوەختە، چونکە ڕێگەپێدانی یاسایی کارێکی حەتمی و زۆر پێویستە.

٢. داواکردنی دامەزراندنی خوێندنگەی ئایینی پێشکەوتوو لەو وڵاتانەی کە مسوڵمانن، لەگەڵ دانانی مەنهەجی تۆکمەی سەردەمیی و ئایینی بەیەکەوە.

٣. وەرگرتنی قوتابی لە خوێندنگە ئاینییەکان بە چاوپێکەوتن بێت و دەربارەی کەسایەتی و بارودۆخ و هۆکاری پێکەشکردنی داواکردنی خوێندنی و ئایا تا چەند ئارەزوومەندانەیە، هەروەها پێویستە تاقیکرنەوەیان بۆ بکرێت پرسیاری جۆراوجۆریان ئاڕاستە بکرێت بۆ شارەزابوون لە ئاستی خوێدەواریی و ڕۆشنبیریان.

٤. دەبێ چاک بزانین کە خوێندنگە تەنها بینایە و بنکە و دەزگا نیە بە تەنها، بەڵکو خوێندنگە لە بنچینەدا واتا: قوتابی و پەرتووک و مامۆستا، چونکە زۆرێک لە خوێندنگە ئاینییەکان لە دەستپێکدا مامۆستا و پەرتووک و قوتابییەک بووە لەژێر دارێک لە دارستانەکان دەستییپێکردووە، بەڵام ئەوە واتای گرنگی نەدان نیە بە بینا و شوێنی گونجاو بۆ خوێندن.

٥. داواکردن لە دەزگا فێرکارییەکان بەلەخۆگرتنی مەنهەجێک کە تێیدا ڕێز لە زانست و ڕۆشنبیرییەکانی تر بگرێت، ماف بدات بە خاوەن زانست و ڕۆشنبیرییەکانی تر و بەهیچ شێوەیەک بەکەم سەیریان نەکات.

٦. کردنەوەی قوتابخانەی سەرەتایی ئایینی ئیسلامی و قوتابی تێدا دەستبکات بەفێربوونی خوێندنەوە و نوسین و خوێندنی قورئانی پیرۆز و لەبەرکردنی، پاشان فێربوونی زمانی عەرەبی لەگەڵ ئەو زانستە گرنگانەی کە قوتابیان لە خوێندنگەکانی تری سەرەتایی فێری دەبن.

٧ .لەگەڵ خوێندنی بابەتی (نەحو و صەرف) کە بناغە و بنەمایە بۆ فێربوون و تێگەیشتنی دەقەکان بابەتی ئەدەب و ڕەوانبێژیی و نووسین و گفتوگۆکردن ( الحوار والمحادثة) فەرامۆش نەکرێت بەتایبەتی دیراسەی نموونەکان لە قورئان و فەرموودە زیاتر بن، چونکە زۆر مامۆستای موجیزی شارەزا هەیە لە زانستە شەرعییەکان ناتوانێ بە زمانی عەرەبی قسە بکات لە دەرەوی کتێبەکە، چونکە دەرسەکەی هەر بە کوردی شەرح کردووە.

٨. گرنگیدان بە چالاکی دەرەوەی دەرس و ناو پۆل، چونکە زانستە ئاینییەکان زۆربەیان شەرح و گوتنەوەیە لایەنی تەتبیقی پراکتیکی تێدا نییە وەک پێویست، قوتابی هەست بە

بێزاری دەکات، هەربۆیە پێویستە قوتابی فێری هەندێک چالاکی زانستی و جەستەیی بکرێ، وەک ڕاهێنانی قوتابیان لەسەر وتار دان، شیعر و سرودبێژیی و بەشداری کردن لە کۆڕ و سیمنار و پێشبڕکێی زانستی و پرسیار و وەڵام بەتایبەتی لە بۆنە ئاینییەکان، تەرخانکردنی کاتی تایبەت بۆ وەرزش کردن، هەروەها گوێڕاگرتن لە وتار و سەیرکردنی بەرنامە بەسوودەکان و خوێندنەوەی گۆڤارە زانستییەکان و دانەبڕان لە زانستی دونیای سەردەم، بەڵام بەپێی کاتی سنوردار و بێ زیادەڕەوی، هەروەها سەردانی زانا بەرزەکان و قوتابخانە ئاینییەکانی تر، و بەشداری کردن لە پانێل و کۆنفراسە زانستییەکان، هەروەها گەشتکردن بۆ شوێنە جوانەکانی ناو وڵات و دەرەوەی وڵات و شوێنە پیرۆزەکان بەتایبەتی سەفەری حەج و عومرە، ئەم چالاکییانە پێویستە بۆئەوەی خوێندنی ئایینی بە وشک و بێزار وەسف نەکرێت، و ئەم گەشتانە سوودی زۆرە بۆ زیاتر چاوکرانەوە و شارەزابوون و مەعریفەت.

٩. گرنگیدان بە لەبەرکردنی قورئانی پیرۆز و فەرموودە، چونکە بەداخەوە یەکێک لە گلییەکان لە خوێندنی ئایینی بەتایبەتی حوجرەکان لەبەرنەکردنی قورئانە، چونکە لە مەنهجی خوێندندا نیە، بەڵکو تەنها هەوڵ و ئارەزووی قوتابییە ئەگەر بۆ خۆی لەبەری بکات.

١٠. گرنگیدان بەلایەنی پەروەردەی ڕۆحیی و ئیمانی و ڕەوشت بەرزی و عیرفان، بەداخەوە هەندێک لە مامۆستایانی خوێندنی ئیسلامی گوتنەوەی وانەکەیان وەک پیشە و کاروکاسبی و سەرچاوەی ژیان ئەنجام دەدەن، نەک وەکو عەقیدە و بیروباوەڕ هەڵگری پەیام و ئەرکێکی شەرعی و پاداشتی دوارۆژ، لەوانەیە ئیلتیزامی ئاینیشیان کەم بێت، بۆیە ساردوسوڕیی و بێتاقەتی پێیانەوە دیارە، لە دەرس و وانەکانیان تام وچێژ هەست پێناکرێت، هەربۆیە زۆر پێویستە مامۆستای دڵسۆز و خاوەن عەقیدەی پاک و خەمخۆری ئایین وانە ئاینییەکان بڵێتەوە.

١١. هاندانی قوتابیان بۆ زانینی پلەوپایە و قەدر و گەورەیی زانستە شەرعییەکان، چونکە زانست و زانیاری مایەی بەدەستهێنانی سەربەرزی دونیا و دوا ڕۆژە، زانایان فەرموویانە: (من أراد الدنيا فعليه بالعلم، ومن أراد الأخره فعليه بالعلم، ومن أرادهما فعليه بالعلم)، بەڵام لەبەر پەراوێزخستنی زانست بەگشتی و زانستە شەرعییەکان بەتایبەت لە وڵاتە مسوڵمانەکان، دەبینین شتێکی بینراوە بەشێک لە قوتابیانی خوێندنی ئایینی کز و بێتاقەتن و هەر بایی ئەوەندە دەخوێنن و ئامادە دەبن لە هۆڵی خوێندن کە فەسڵ نەکرێن و بتوانن تەنها دەربچن و بڕوانامەکە بەدەستبهێنن، هەروەها دەبینین کە زۆربەی وانەکان کورتکراونەتەوە لە چەند لاپەڕەیەک لە پێش هوڵی تاقیکردنەوە فڕێ

دەدرێن و دوای تاقیکردنەوە قوتابیان هەڵی ناگرنەوە، پاشان خزمەتگوزارەکان کۆیان دەکەنەوە بۆ فڕێدان. هەربۆیە دەبێت کاری جیدی بکرێت لەسەر زیندووکردنەوەی لایەنی ڕۆحیی و پەروەردەیی و بەها بەرزەکان و ڕوونکردنەوەی قەدر و گەورەیی و پیرۆزی زانست بۆ سەرجەم قوتابیان و مامۆستایان.

١٢. بەخشینی بڕوانامەی زانستی دوای ئەوەی مامۆستاکەی بڕیار دەدات کە شایەنی ئەو پلەیەیە، دەبێت پەسەند بکرێت لەلایەن لیژنەیەکی بالای گەورە زانایان بە بەشداری مامۆستای خۆی لە هەڵسەنگاندنی ئاستی قوتابی موجاز.

١٣. ناردنی قوتابیانی دەرچووی حوجرە و کۆلێژی زانستە ئیسلامییەکان بۆ دەرەوەی شار و ناحیە و قەزاکان بۆ کاری پێشنوێژی و وتاربێژیی و بانگەوازی لە سەرەتای دامەزراندنیان لەلایەن وەزارەتی ئەوقاف و کاروباری ئاینییەوە وەک مامۆستایانی خوێندنگاکانی وەزارەتی پەروەردە، دواتر گوستنەوەیان بۆ مزگەوتەکانی ناو شار.

١٤ .سەرفکردنی خەرجی بۆ مامۆستا ئاینیيە خۆبەخشەکان لەلایەن وەزارەتی ئەوقافەوە لەشێوەی موحازەراتی وانەبێژانی وەزارەتی پەروەردە بە بڕێکی شایستە و گونجاو.

١٥. هەبوونی پارێزبەندی یاسایی بۆ زانایانی ئایینی بەپێی یاسای داڕێژراو لەبەرئەوەی پێگەی ئایینی و کۆمەڵایەتیان کەمتر نیە لە وەزیر و پەرلەمانتارەکان.

١٦. هاندانی خێرخوازان بۆ دروستکردنی قوتابخانە ئاینییەکان و ڕوونکردنەوەی پاداشتەکەی بۆیان، هەروەها دابینکردنی یارمەتی بۆ قوتابیانی خوێندنی ئایینی (كفالە طالب العلم) و مامۆستایانی وانەبێژ و بانگخواز (كفالة المدرسين والدعاه) لە بەرامبەر تەفەروغ و خۆیەکلایکردنەوەیان بۆ خزمەتی ئایین مسوڵمانان و گرنگی ئەنجامدانی ئەوکارە مەزنە و گەورەیی پاداشتەکەی.

١٧. سزادانی یاسایی کەسانێک کە جلوبەرگی مامۆستایانی ئایینی دەپۆشن، چ بۆ گاڵتەپێکردن یا خۆیان لە چینی مامۆستایانی ئایینی نین، وەک چۆن کەسێک ئەگەر جلوبەرگی سەربازی یان پۆلیسی لەبەر بکات وکارمەندی ئەم دەزگایەش نەبێت سزادەدرێت.

١٨. بڵاوکردنەوەی بیرۆکەی دابینکردنی زەوی و بینا وتەرخانکردنیان بۆ دروستکردنی قوتابخانە ئاینیەکان و شوێنی حەوانەوەی قوتابیان، وەک بابەتی وەسیەتنامەی شەرعی و موڵکی وەقفی خەیری، یا بەکرێدانی ئەم خانوو باڵەخانانە و سەرفکردنی داهاتەکەیان لە بەرژەوەندی مامۆستا و قوتابیانی ئەم خوێندنگایانە.

١٩. پەیوەندیکردن بە کەسایەتی و دەزگا خێرخوازیەکان بۆ دابینکردنی مانگانەیەک بۆ مامۆستا و قوتابیانی خوێندنگا ئاینییەکان بۆ کڕینی جلوبەرگ و خواردنیان لە شێوەی

سەبەتەی خۆراک یا کڕینی کتێب بۆیان لەشێوەی (مكتبة طالب لعلم) چاپ بکرێت وەکو خێر و سەدەقەی نەبڕاوە.

٢٠. پاراستنی نووسین و کتێب و دەستنووسەکانی زانایانی ئایینی کوردستان کە بەرهەمی ئەم خوێندگا ئاینییانەیە، بەشێک لەوکتێبانە پرۆگرامی خوێندن بووە لە قوتابخانەکانی بەغدا و قاهیرە و دیمەشق و ئەستنبوڵ و خاکی حیجاز لە هەردوو حەرەمی مەککە و مەدینەی پیرۆز. هەربۆیە وەک وەفایەک بۆ ئەم زانایانە کە میللەتی کوردیان بە هەموو جیهان ناساند پێویستە دەستنووسخانەی تازە و پێشکەوتوو تایبەت بە بەرهەمی زانایانی ئایینی دروست بکرێت بەرهەمەکانیان کە سامانێکی بەهادارە بپارێزرێن لە فەوتان بزربوون و خزمەت بکرێت و لە چاپ بدرێت و بگاتە بەردەستی فێرخوازان.(ڕۆڵی کورد لە خزمەت کردنی هەردروو حەڕەمی مەککە و مەدینەی پیرۆز، پ.د.کمال صادق یاسین، ل٦٦-١٢٧).

لەکۆتاییدا : پێویستە قوتابی لە کۆلێژی زانستە ئیسلامییەکان و پەیمانگا و خوێندگا ئاینییەکان خۆی بەکەمتر نەزانێت لە قوتابی کۆلێژی پزیشکی، دەبێت شانازی بە زانست و پسۆڕییەکەی خۆیەوە بکات، چونکە ئیمامی شافیعی دەفەرموێت: « العلم علمان: علم الأبدان، وعلم الأديان، فعلم الدين هو الفقة، وعلم الدنيا وهو الطب»،(الموسوعة الفقهية الكويتية،١١٧/١١).

واتە: زانست دووانن: زانستی لاشەی مرۆڤە، و زانستی ئایینە، مەبەست لە زانستی ئایین فیقهی شەرعییە، وە زانستی لاشەش زانستی پزیشکییە.

## سەرچاوەکان


١- للاستاذ الدكتور عبد الكريم البكار: حول التربيه والتعليم، دار القلم، ط٣،٢٠١١م.

٢- كمال حبيب: مناهج التعليم الدينى فى العالم الإسلامى، مجله البيان، العدد ١٧٣، ٢٠٠٣، .

٣-أزمه التعليم المعاصر، زغلول ڕاغب النجار، مكتبه الفلاح، ط١، الكويت، ١٩٨١ .

٤- الموسوعه الفقهية الكويتية، دار السلاسل، الكويت، ط٢،١٩٨٤.

٥- عبد الرحمن النحلاوى: التربية الإسلاميهة والمشكلات المعاصره، المكتب الإسلامى، بيروت، ط٢، ١٩٩٥م.

٦-أهداف التربيه الإسلاميه، ماجد عرسان الكيلانى، مكتبه دار التراث، ١٩٩٨ .

٧- الملا محمد بن عبد الله الجلى وجهوده العلميه، د.جواد فقى على الجوم حيدرى، مكتبه التفسير، أربيل، ٢٠٠٦.

٨- دیاری مەلا محمدی کۆیی، چاپخانەی هولێر، چاپی چوارەم، ١٩٦٩.

٩- محەمەد عەلی عەلیاوەیی: ژیانی فەقێیانی کوردستان لەسەدەی ١٣و١٤ کۆچی، سلێمانی ٢٠٠٣.

١٠- عەزیزی مەلای ڕەش: خورجەیەک لەفۆرکلۆری دەشتی هەولێر، چاپخانەی حاجی هاشم، هەولێر،٢٠١٢.

١١.المدارس العلميه ودورها فى إعداد العلماو والدعاه فى أربيل، بلال ملو برخال البرادوستى، طبعة خاصه، ٢٠١٨.

١٢- پ.د.کمال صادق یاسین لەک: ڕۆلی کورد لە خزمەت کردنی هەردوو حەڕەمی مەککە و مەدینەی پیرۆز-لێتوێژینەوەکی مێژوویی ئیسلامیە، چاپی یەکەم، ٢٠٢٢.



عادل صدیق عەلی

# لە بامۆکەوە بۆ بینینی عەبدولکەریم قاسم

## بیرەوەرییەکانی ژیانی فەقێیەتی مەلا لەتیفی بامۆکی

ئەم چاوپێکەوتنە ڕۆژی ٢٠١٧/١/٢١ لە ماڵەکەی خۆیان لەگەڵ بەڕێز مامۆستا مەلا عەبدوللەتیفی بامۆکی ئەنجامدراوە، بڕیاربوو بۆ چەند بابەتێکی دیکەی گرنگ سەردانی بکەینەوە، بەڵام سەرقاڵی و کەمتەرخەمی ئێمە و مەرگی مامۆستا ئەو دەرفەتە گەورەی لەکیس داین. ئەوەش بڵێم، ئەم زانیارییانەی خوارەوە لەشێوەی پرسیار و وەڵامدا بووە، بەڵام ئێمە پرسیارەکانمان هەڵگرتووە و ناوەڕۆکی زانیارییەکانی بەڕێزیانمان بەم شێوەیەی خوارەوە داڕشتووتەوە.



**ناساندن:** ناوم عەبدوللەتیف مەولود عەبدولکەریم عەلی یە، ساڵی ١٩٣٧ لە گوندی بامۆک لەدایکبووم، باوکم لە بنەڕەتدا خەڵکی گوندی (ڕووان)ە، کە گوندێکی گەورەی ناوچەی جوانڕۆیە، سەر بە عەشیرەتی زەردۆییە. باپیرە گەورەم(عەلی) هاتووەتە گوندی سازان، دوو کوڕی هەبووە، عەبدلکەریم و حەمەکەریم، عەبدولکەریم چووەتە گوندی بامۆک، شوانی و گاوانی فەقیری کردووە، حەمەکەریمیش لە سازان ماوەتەوە، هەر لە سازان باخێکی کڕیوە، ئێستا پێی ئەڵێن تلێوەرێ، هەر لە تلێوەرێ ئەولقاری زەڕین، حاجی حاسەن و حاجی هوسەین و ئەوانە ئامۆزای حەقیقی ئێمەن، باوکیشم کە هاتووەتە هەڵەبجە دوو برا بوون، محەمەد و مەولوود. محەمەدیش سێ منداڵی هەیە، مەولەویش سێ کوڕی هەیە لەگەڵ دوو کچ، کوڕەکانی عەلی و سەعید و لەتیف و کچەکانیش سوییە کە شووی کردووە بە باوکی حەمە هەلاج، تەنها حاجی محەمەدی لێ بووە، ئەویتریشیان ناوی زێبا بووە.

دایکیشم ناوی (خاتوون)ە و کچی دەروێش یوسف بووە، دەروێش یوسف خەڵکی دێ سووره لای سەلاسی باوەجانە. خاتوون ساڵی ١٩١٠ لە تازاوای نزیک پاوە لەدایکبووە، ئەوکاتە لەوێ گرانی بووە، عەجەم هاتوون کچیان کڕیوە، دەروێش یوسفەیش چوار کچی هەبووە، یەکێکیان تەمەنی ١٢ ساڵ بووە ئەوانیتریان هەشت و حەوت و پێنج بوون، کە بریتی بوون لە: خانم و خاتوون و ئاڵتوون و مایجان. عەجەم هاتوون وتوویانە کچ ئەکڕین، پێیان وتووە دەروێش یوسف ئەم کچانە دوانیان بفرۆشە، با منداڵەکانی تری پێ بەخێو بکەین، ئەویش زۆر نارەحەت ئەبێ و ڕازی نابێ، گوڵ ئەندام کە خێزانێتی لە سەیدەکانی تازاوا ئەبێ، ئەو توانەی کە لە پشتی سەریاسەوەیە ئەوە موڵکی باوای ئێمەیە، ئیتر کچەکان نافرۆشێ. دواتر دێت بۆ ئەمبەری سیروان بۆ گوندی سازان،

ئەوکاتیش بەهار ئەبێ، بۆیە خۆی مەشغوڵ ئەکات بە کنگر و گێلاخە و گیا و ئەمانە. لە سازان باخێک هەیە پێی ئەڵێن باخی شامک، ئەو کاتە کە ئەو دێتە ئەوێ توو پێ ئەگات، خاوەن باخەکە پێی ئەڵێت دەروێش یوسف ئەم باخە بەخێو بکە بۆ خۆت. توووەکەی بچنەرەوە، ئەو ساڵە مناڵەکانی بە توو و بە گیا بەخێو ئەکات، دوای ماوەیەک ئەوێ بەجێ ئەهێڵێت و ئەڕوات بۆ گوندی بەڵخە لە هەورامان، لە بەڵخە خانم ئەدا بە شوو، هەر لەوێ دایکی منیش ئەدا بە شوو بە پیاوێک بەناوی عەبدولقادر، دوای دوو منداڵ عەبدولقادر کۆچی دوایی ئەکات، مناڵەکان ناویان ئەمنە و شەریف ئەبێ، شەریف برای منە لە بامۆک وەفاتی کردووە و دوو کوڕی هەیە بە ناوەکانی محەمەد و ئەحمەد، ئەمنەش شوو ئەکات بە عوسمانی مەلا ئەحمەدە بامۆکی.

هەرچۆنێک بێت دایکم بە بێوەژنی و بەم دوو مناڵەوە دێتە بامۆک، لەوکاتەشدا ژنەکەی باوکم تۆراوە و چووەتەوە بۆ ئێران و لە ئاوی سیرواندا خنکاوە، ئەو ژنەی هەر خەڵکی ڕووان بووە، دایکیشم کە دێتە ئەوێ و دوو مناڵی پێیە و زەمانی فەقیری بووە، باوکم خوازبێنی خاتوون ئەکات و ئەبێتە هاوسەری، دواتر دایک و باوکم چوار منداڵیان ئەبێ بەناوەکانی: عەلی و لەتیف و سەعد و خەدیجە. من لە گوندی بامۆک لەدایکبووم.

بامۆک(١): بامۆک ئەو کاتە تەقریبەن چل ماڵێ پەنجا ماڵێکی تیا بوو، لە دیارترین پیاوە گەورەکانی بریتی بوون لەمانە: ئەحمەدی حاجی، باوکی محەمەد و نەجمەدین، حەمەلاو بەگ، مامۆستا مەلا ساڵحی بامۆک، عەبدوڵڵای موراد. ئەم گوندە شوێنی حەیوانداری بوو، لە عەبابەیلێ و هەڵەبجە و کۆکۆییەوە، کە حەیوانیان بەخێو کردووە هێناویانە بۆ نزیک بامۆک، چونکە کەژ و شاخێکی زۆری هەبووە و هەمیشە پڕ بووە لە گیا و پووش و پەلاش، بەکورتی شوێنی حەیوانداری بووە، لەبەرئەوە ئەغڵەب دەوڵەمەنی تیا بووە. هەروەها ساحێبی خەرمان و خەلە و ئاو و کانی و کارێزێکی زۆر بووە، لەگەڵ ئەوەشدا ئەرزێکی زۆری کشتوکاڵی هەبووە، خەڵک تیایدا بە خۆشی ژیاوە.

**خوێندن و فەقێیەتی:** مەولودی باوکم، سۆفی شێخی حیسامەدین بووە، لە بامۆک قازی بەخێو کردووە، هەموو ساڵێک ٢٠-٣٠ قازی بووە، پاییزی ساڵانە چوار قازی ئەخستە ناو تۆشەبەرەیەک و لەگەڵ من یان عەلی برام ئەڵێ با بچین بۆ ماڵی شێخ لە باخەکۆن، کە ئەچووینە باخەکۆن شێخ بەخێرهاتنی ئەکردین، باوکیشم دەستی شێخی ماچ ئەکرد، جارێک شێخ ئەپرسێت: مەولود چەند کوڕت هەیە؟ من یەکێکم لەوانەی بە

---

١. ئەم گوندە دەکەوێتە باشووری ڕۆژهەڵاتی هەڵەبجە، بەر لە گەورەبوونی هەڵەبجە (٢-٣) کیلۆمەتر لەناو شارەوە دوور بووە، بەڵام لە ئێستادا خەریکە تێکەڵ بە هەڵەبجە دەبێت، لەکاتی خۆیدا یەکێک بووە لە گوندە جوان و دەوڵەمەند بە سەرچاوەکانی ئاو و باخ و باخاتەکانی هەڵەبجە.

سواری ئەو کەرە چوومەتە باخەکۆن، باوکیشم ئەڵێ: قوربان سێ خزمەتکارم هەیە، حەمەلەتیف و حەمەعەلی و حەمەسەعید، ئەڵێ ناوەڕاستەکەیان بخەرە بەر خوێندن، ئیتر شێخ نازانێ ئەو منالە چلکن و چلمنە کە لێرە وەستاوە حەمەلەتیفە، ئەویش ئەڵێ قوربان کەڵکی پێوە نییە و بەخوا پارەشم نییە مەلا ڕەشیدی بامۆک مانگانە داوای پەنجا فلس ئەکات، شێخ ئەفەرموێت بڕۆ بەناوی منەوە پێی بڵێ من پارەکەی ئەدەم، ئەگەر هەر ڕازی نەبوو بڵێ بە فلان ناونیشان ئەبێ دەرسی قورئانی بە لەتیف بڵێی، باوکم کە هاتەوە بۆ بامۆک منی برد بۆ لای مەلا ڕەشید، باوکم ئەڵێ حەزرەتی شێخ وای فەرمووە، ئەویش ئەڵێ مەولود بەیەک مەرج، جزمی عەمەی پێ تەواو ئەکەم، ئەویش ئەوەیە گا ڕەشم بدەیتێ، ئەویش ئەڵێ ئەوا ئێوارە گا ڕەشم لە ماڵی ئێوەیە. باوکم گا ڕەشی ئەداتێ بۆئەوەی حزمی عەمە بە من تەواو بکات. حوجرەکەی مامۆستا ئەهلی بوو، تەنها بۆ فاتیحە ڕەوانکردن بوو. حوجرەکە هەر لە پشتی مزگەوتەوە بوو، ئەگەر باران بوایە لەناو مزگەوتدا ئەمانخوێند، ئەگەر خۆر بوایە لە پشتی مزگەوتەوە، هەریەکە و دۆشەکێکی ئەبرد لەسەری دائەنیشتین.

ئەوانەی لەوکاتەدا لەوێ بووین ئەمانە بوون: حەمەبچکۆل، حاجی شەریف، مەلا محەمەد، من بووم، کچێک بەناوی سۆبیە بوو، کە تەمەنی -٦- ٧ ساڵ ئەبوو، مریەم و کافێ و فەیمە، فەیمە کچی مامۆستا مەلا ڕەشید خۆی بوو، دواتر شووی کرد بە ئەوڕەحمانی خەلیفە، دوانیی تر لە کچەکان برازای مامۆستا خۆی بوون. سەبارەت بە وەرگرتنی پارە و ماڵیان لە ئەوانی تر، من ئاگادار نیم، بەڵام لەبەرئەوەی خزمی خۆی بوون، پێ ئەچێ هیچی لێ وەرنەگرتبن. لەو چەند منالە تەنها من و مەلا محەمەدی کوڕی مامۆستا دواتر خوێندنمان تەواو کرد.

بەڵێ، ئەوکات لە حوجرە ئوسوڵی وەها بوو ئەیانوت: یا الله یا فتاح و الف بێ تێ بەوشێوەیە، ئەوەی بۆ نووسیمەوە، مەلا محەمەدی کوڕی لە من گەورەتر بوو، لە (والشمس) بوو من (ياالله)م دەستپێکرد، دوای ئەوە مەلا محەمەد گەیشتە (عبس وتولى) من گەیشتمە (والشمس). مامۆستا فەرمووی ئادەی ڕۆڵە بخوێنە: بسم الله الرحمن الرحيم، واو سەر واو، میم ...هتد، وتم مامۆستا خۆم ئەیزانم، وتی چۆن ئەیزانی، وتم بەخوا ئەیزانم، مامۆستا گوێی لێگرتم (والشمس)م بۆ خوێند، (لا أقسم)م بۆ خوێند، (والفجر)م بۆ خوێند، (والسماء والطارق)م بۆ خوێند، هەمووی سوورەتەکانم بۆ خوێند تا گەیشتمە دەرسەکەی مەلا محەمەدی کوڕی، وتی فەقێ محەمەد، مامۆستا ئاوا پوکالاوێکی لە مەلا محەمەدی کوڕی کرد و وتی یاخوا عەمرت نەمێنێ، باوکی ئێمە سێ ساڵ شوانی کردووە بۆئەوەی تەنها فاتیحا ڕەوان بکەین، ئێستا ئەوەتا بە گوێگرتن لە تۆ، فێری قورئانەکە بووە.

> **خەلیفە مەلا محەمەد بەمەرجێك دەرسی بەمن دەگوت هەموو ڕۆژێك مەشكەیەك دۆی بۆ ببەم، منیش هەتاكوو قورئانم لەلای خەتم كرد، هەموو ڕۆژێك مەشكەیەك دۆم لە بامۆكەوە ئەهێنا بۆ ماڵی مامۆستا لە هەڵەبجە.**

مامۆستا جزمی عەممەی پێ تەواو کردم و وتی خواحافیزت بێ. تەقریبەن لە ماوەی شەش مانگدا جزمی عەممەم تەواو کرد. دوای ئەوە باوکم بردمی بۆ لای مەلا مەولود، هەر خەڵکی بامۆک بوو لە بامۆکیش دائەنیشت، مەلا مەولود چوار کچی هەبوو، کوڕی نەبوو، لای ئەویش جزمی تەبارەکم تەواو کرد، خوێندنکەشم بەخۆڕایی بوو، دواتر مامۆستا مەولود لێی قەوما، زاوایەکیان لە ماڵەکەیان کوشت. ئەویش لێی تێکچوو وازی لە حوجرەکە هێنا، دواتر ناردینیان بۆ لای مەلا حەمەسەعید ناوێک کە حافز بوو، ئەویش هەر خەڵکی بامۆک بوو، وەجاخ کوێر بوو، بەڵام قورئانی لەبەر بوو، مەلایەتی تەواو کردبوو، بەڵام چاوی حافز ببوو، وتی من دەرسی پێ ناڵێم، من قورئان ئەخوێنم ئەویش لەگەڵمدا بیخوێنێ، جزئی (قد سمع الله) و (والذاریات) و (حام میم)ەکانم لای ئەو خوێند، تا گەیشتمە سورەتی (یس). لەمکاتەدا (١٩٤٢) باوکم کۆچی دوایی کرد.

دوای ئەوە بردمیان بۆ لای خەلیفە مەلا محەمەد کە ماڵیان لە گەڕەکی مۆردانەی هەڵەبجە بوو، مامۆستا فاتمەی کچی دابوو بە مامۆستا شێخ عومەری قەرەداغی، باوکی شێخ باباعەلی. وتی بەشەرتێ دەرس بەم کوڕە ئەڵێم هەموو ڕۆژێک مەشکەیەک دۆمان بۆ بهێنێت. منیش ئەبوایە هەموو ڕۆژێک مەشکەیەک دۆم بۆ ببردایە، تا قورئانم خەتم کرد.

دوای ئەو ڕۆیشتم بۆ لای مەلا محەمەدی حاجی مەلا مستەفای کۆکۆیی لە مزگەوتی تەکیە، کە بە مەلا بۆنخۆش ناسرابوو، لەوێ دەستم کرد بە خوێندنی کتێبە علمییەکان (ئیسماعیل نامە، ناگەهان، مەخلوق، پەنج نامە عەتار...هتد)، شیعری فارسیشمان ئەخوێند، نزیکەی دوو سێ مانگ لەوێ بووم، لەو ڕۆژانەدا بوو مامۆستا لەسەربان کەوتە خوارەوە و کۆچی دوایی کرد، بەوهۆیەوە من بێ دەرس مامەوە، ئەو کاتەش کەمێک گەورە ببووم، لەم ماوەدا بۆ یەکەمجار وتیان: لەتیف بۆ ناچی بۆ فەقێیەتی؟ وتم بۆ کوێ بڕۆم؟ وتیان لە گوندی عەنەب چوار موستەعید هەیە پێویستیان بە سوختەیە، چووم بۆ عەنەب و

دەستمکرد بە خوێندن.

خوێندنی فەقێیەتیش پلەی هەبوو، لەپێشەوە قوتابی(قوتابی لە (کتاب)ی عەرەبییەوە هاتووە، جەمعەکەی (کتاتب)ە، ئەم کەتاتیبە مەدرەسەیەکی بچووکی مولحەق بە مزگەوتە) ئەمە سەرەتاکەی، کە دەردەچوو لەوێ و دەیتوانی ڕەفیقی فەقێ بکات و ماڵان بگەڕێ پێیان ئەگووت سوختە، دوای ئەوە پێی ئەڵێن فەقێ، دوای ئەوە ئەبێ بە مستعید، لە کۆتاییدا ئەبێت بە مەلا. ماددەکانی خوێندنیشیان زۆر جیاواز بوون. قوتابی، قورئان بوو، سوختە عەوامیلی جورجانی و ئنموزەج و تەسریفی زنجانی بوو. دوای ئەوە کە دەبوو بە فەقێ تەسریفی مەلا عەلی و مەراح و جامی و نەحو سەرفی ئەخوێند، کە بەرز ئەبوویەوە عیلمی مەنتیق و عیلمی کەلام و عیلمی بەحس و مونازەرە و عیلمی فیقهی ئەخوێند.

ماوەی سێ مانگ لە عەنەب بووم، چوار فەقێ لەوێ بوون، ئەوانیش: شەمسەدین، مەلا ئەحمەد، مەلا محەمەد، ناوی ئەوی دیکەیانم بیر نەماوە)، ئەمانە لای مامۆستا مەلا قادری عەبابەیلێ ئەیانخوێند، کە برای مامۆستا مەلا محەمەدی مزگەوتی (دارالاحسان) بوو. لە عەنەب عەوامیلی جورجانیم و پاشان دەستم کرد بە ئنموزەج، دوای ئەوە عەنەبم جێهێشت و ڕۆیشتم بۆ عەبابەیلێ، مزگەوتەکەی عەبابەیلێ گەورە بوو، چوار ژووری حوجرەی هەبوو، ئەوکاتە نزیکەی پێنج موستەعید و دوانزە سوختە لێ بوو، موستەعیدەکان بریتی بوون لە: شێخ محەمەدی قەرەداغی(خەتیب)، مامۆستا شێخ خالیدی موفتی، شێخ محەمەدی شەمێرانی، مامۆستا مەلا ڕەسوڵی باوەجانی، مەلا ئەحمەدی موفتی زادە، ئەمانە لەوێ ئاخر ماددەیان ئەخوێند لای مامۆستا مەلا حەسەنی عەبابەیلێ. سوختەکانیش بریتی بوون لە: لەتیف، مەلا محەمەدی بامۆکی، مەلا عومەر ڕێشاوی، مەلا محەمەدی ڕێشاوی، مەلا حسێنی عەنەبی و ناوی ئەوانی تریانم بیر نەماوە. ئەمانە لە حوجرا ئەمان خوێند و ئەماینەوە، حوجرەی سوختە و موستەعید جیا بوو. کاری ڕۆژانەش لەنێو فەقێکان خۆیاندا دابەشکرابوو، وەک چێشت لێنان و دارکۆکردنەوە و چا لێنان و گسکدان ..هتد.

کتێبەکانیشمان هەموویان دەستنووس بوون و موڵکی حوجرە بوون، تەنانەت قورئانیش، ئێمە وایان فێرکردبووین، هەر کتێبێکمان بخوێندایە، شەوەکەی ئەبوایە ئەو دەرسەی بەیانی ئەمانخوێند بمانووسییایەتەوە، بەیانی من ئەمە ئەخوێنم تا ئەوێ ئەخوێنم ئەمنووسییەوە، بە قامیش و بە نەوعە مرەکەبێک کە خۆمان دروستمان ئەکرد، کاغەزمان ئەسوتاند لەگەڵ دۆرنج و ئەوانەدا ئەمان کوڵاند تا خەست ئەبوویەوە، دواتر ئەمان کردە ناو شووشەیەکەوە، ئینجا قەڵەمی قامیشمان دائەدا بەوە ئەمانووسییەوە، خەتیشمان خۆش ئەبوو، کاتێک کە کتێبەکە تەواو ئەبوو کتێبێکی مەعقولی لێ دەئەچوو کە هی خۆت هەبوو.

من تا ساڵی ١٩٤٧ لە عەبابەیلێ مامەوە، دواتر مەلاکان هەندێکیان ڕۆشتنەوە و هەندێکیان نەمان، کە مەلا ساڵحی بامۆکی لەوێ ئیجازەی مەلایەتی وەرگرت و گەڕایەوە بۆ بامۆک و ئێمەش بامۆکی بووین لەگەڵ مامۆستا گەڕاینەوە بۆ گوندەکەی خۆمان، تا ئەکاتەش هەر سوختە بووم و لە ماڵی خۆماندا ئەم خوێند، بە ڕۆژیش ئەچووم بۆ لای مامۆستا مەلا ساڵح کتێبی (اظهار و تصریفی مەلا عەلی و ..هتد) ئەخوێند، ئەو کاتە لەوێ دوو موستەعیدمان هەبوو، کە بریتی بوون لە مەلا حەمەئەمینی سەراویی و مەلا عەبدوڵلای گونەیی. ئەم حاڵەتە بەردەوام بوو هەتا بوو بە ١٩٤٨، لەو ساڵەدا ڕۆیشتم بۆ گوندی چنار بۆ لای مامۆستا مەلا شەفیق، چنار چوار موستەعیدی لێ بوو، ئەوانیش: مامۆستا سەیدعەلی تاوگۆزی، مەلاساڵحی زەردۆیی، مامۆستا شێخ نەجمەدینی موفتی و مەلایوسفی تینی بوون، ئێمەش لەوێ سوختە بووین، ئەو ساڵە من تەصریفی مەلا عەلیم تەواو کرد، دواتر گەڕامەوە و ڕووم لە بیارە کرد، لەوێ دەستم کرد بە خوێندنی جامی، من لای موستەعیدێک ئەمخوێند کە ناوی مەلا سەعدوڵلای نۆدشەیی بوو، ساڵی ١٩٥١-١٩٥٢ لە بیارە بووم. ئەو کاتەی من لە بیارە بووم خانەقا نزیکەی ٨٠ فەقێی لێ بوو، مەدرەسەی سەرەوە ٣٠ فەقێی لێ بوو، چواریان فەقێی تاڵشی بوون لە ماڵی شێخ نانیان ئەخوارد، تاڵش شارێکە لە شمالی ئێران، سوننین و مەنسوبی شێخی بیارە بوون، من هەتا تەقریبەن ١٩٥٢ لە بیارە مامەوە، ئەو ماوەیە لە خانەقا ئەخەوتم. با ئەوەش بڵێم، هەموو ئەم فەقێیانە(ئەم ٨٠ فەقێ لەگەڵ ٣٠ فەقێ دەیکردە ١١٠ فەقێ) ماڵی شێخ عەلادین نانیان ئەدان و خزمەتیان ئەکردن.

لەناو فەقێدا باوبوو سێ شەممان و جومعان پشوو بوو، فەقێ لە شەوانی سێ شەممە و جومعاندا دائەنیشتن قەصیدەی بوردەیان ئەخوێندەوە، قەصیدە لە مەدحی پێغەمبەر (د.خ)، دواتر یارییان ئەکرد، وەک پاشا و وەزیر و فڕێ فڕێ قەل فڕێ، ئەمە وەزیرە، ئەمە پاشایە حوکم ئەکات، مەحکەمەیەک دائەنێ، تەمسیلێکی سادەیە. یەکێکیان هەڵئەبژارد بە مەلیک، یەکێ بە وەزیر، ئینجا حوکمیان ئەکرد، ئەیوت بڕۆ بۆ کانی ئاو بێنە، لە فڵان شوێن ئەم پەڕۆ بکە بە دارا. یان شەڕە شیعریان دەکرد، ئەوکاتیش زیاتر خەڵک ئالوودەی شیعرەکانی مەحووی و نالی بوو.

فەقێش ئەنواعی هەبوو، بچووک هەبوو تەمەنی ٧ ساڵ و ١٢ ساڵ و ١٥ ساڵ هەبوون، من و مەلا هادی دزاوەری گەورە بووین، سیوتی و ئەمانەمان ئەخوێند، هەتا شێخ وەفاتی کرد من لە بیارە مامەوە، دوای ئەوە هاتمەوە بۆ مزگەوتی گەورە بۆ لای مامۆستا شێخ جەمیلی موفتی لە هەڵەبجە، ساڵێکیش لەوێ خوێندم، دوای ئەوە چووم بۆ سلێمانی، ئەو کاتە ئێمە لە سلێمانی ناوبەناو (دەنگی فەقێ)مان هەبوو، حەمەی مامۆستا

مەلا کەریم و فاتیحی برای دەریان ئەکرد.

پاش ماوەیەک سلێمانیم بەجێهێشت و ڕوومکردە کەرکووک، لەوێشەوە چووم بۆ خانەقین، چوار ساڵ لە خانەقین مامەوە، واتە تا ساڵی ١٩٥٧، لای مامۆستا مەلا ئەحمەد، مامی ئەم فاروقی مەلا مستەفا ئەمخوێند، ئەوکاتە ئەویش لای مامی دەرسی عەرەبی ئەخوێند، بەڵام خۆی تەلەبەی کولییەی حقوق بوو. دواتر خانەقینم بەجێهێشت و گەڕامەوە عەبابەیلێ بۆ لای مامۆستا مەلا حەسەن، دوای ئەویش ڕۆیشتم بۆ لای مامۆستا مەلا عوسمانی پریسی، لەناوەڕاستی ساڵی ١٩٥٧ هەر لە پریس خوێندنم تەواو کرد و ئیجازەی مەلایەتیم وەرگرت، ماوەی سێ مانگێکیش لە خزمەت مەلا ساڵحی تریفەش (مەلا ساڵحی گەورە) بووم.. من بەخزمەتی مەلا عەزیزی پریسیش گەیشتبووم، بەڵام هیچم لای ئەو نەمخوێندووە.

ئەوکاتە دیارترین مەلا گەورەکانی هەڵەبجەی ئەمانە بوون، مامۆستا مەلا عەزیزی پریس، مەلا حەسەنی عەبابەیلێ باوکی مەلا ڕەئوف، مامۆستا شێخ جەمیلی موفتی، مامۆستا شێخ خالیدی موفتی، مامۆستا شێخ نەجمەدینی موفتی، مەلا محەمەدی گەورە، کە عەبابەیلێی بوو، بە مەلا محەمەدی مزگەوتی (دارالاحسان) ناسرابوو، مەلا محەمەدی مەلا بەها.

**دوای ئیجازە وەرگرتن**: کە ئیجازەم وەرگرت شوێن نەبوو مەلایەتی تیادا بکەم، هیچ دێیەک حازر نەبوو نان و ئاوێکم بداتێ، کە شۆڕشی ١٤ی تەممووزی ١٩٥٨ ڕوویدا ئیتر من چوومە ناو پارتییەوە، لە ماوەیەکی زۆر کەمدا پلەی حیزبایەتیم بڕی، من دوکانم هەبوو، ڕۆژنامەی خەبات دەهات و دەمفرۆشت، خەباتم دەدا بە ٢٠ فلس، ٥ی بۆ خۆم بوو، پانزەمان ئەناردەوە بۆ ڕۆژنامەکە، دوکانەکەم لە پاڵ دوکانی حاجی عێزەتی عەبابەیلێیی بوو، کە نوقڵ و شتی ئەفرۆشت، لە خوار ئەویشەوە دوکانی شێخ لەتیف هەبوو، شەربەتی ئەفرۆشت، لە پاڵ قەرتاسیەی هوشیاری ئێستا. ڕۆژانە بیست ڕۆژنامەم لە بەغداوە بۆ ئەهات، تەنها خەباتم ئەفرۆشت، نزیکەی ساڵێک زیاتر بەردەوام بووم.

ئیتر مەلایەتیم نەکرد و شۆڕشی ١٤ی تەممووزیش هاتە پێشەوە، من وەختی خۆی کە لە خانەقین بووم لای موفتی مامۆستا مەلا ئەحمەدی فائیز، کۆمەڵێک ئەفسەری عێراقی هاتوچۆی موفتییان ئەکرد، عەبدولکەریم قاسم و عەبدولسەلام عارف و شێخ نوری شێخ ڕەشید و عادل جەلال کە خەڵکی خانەقین بوو لەگەڵ مەلا مستەفا، ئەمانە هەموو هەینییەک ئەهاتن بۆ لای لەوێ نوێژیان ئەکرد، لیواکەیان لە جەلەولا بوو، لیوای ١٩ و ٢٠، چونکە سوننی بوون ئەهاتن لەوێ نوێژیان ئەکرد، موفتی لەبەرئەوەی نەختێ سەر بە حکومەت بوو، حکومەت گرتبووی بە کرێ لە ساڵانی چلەکاندا بۆ تەعریبکردنی ئاکرێ، مامۆستا لەگەڵ عەشایری سەبعا دەستی هەبوو. کە ئەمان ئەهاتن موفتی منی

بانگ ئەکرد ئەیوت وەرە موناقەشەی عەرەبییان لەگەڵ بکە بزانە ئەوانە عەرەبی ئەزانن، من باسی نیوەی دووەمی ساڵی ١٩٥٧ ئەکەم، عەرەبییەکی باشم ئەزانی و نزیکەی ١٠ هەزار شیعری عەرەبیم لەبەر بوو. شیعری مسند لەبیبم لەبەر بوو، شیعری بوحتەریم لەبەر بوو، شیعری ئەبو نەواسم لەبەر بوو، شیعری سیوتیم لەبەر بوو، ئەمانە وەک بەرنامە و مەنهەج و حەزی خۆم لەبەرم کردبوون. ئەوکاتە تموحێک هەبوو بۆ عەرەبی فێربوون، والحاصل، جەریدە کەوتە کزی، اتحاد الشعب دەرچوو، جەریدەی خەبات زۆر قیمەتی نەئەکرد، پارتییەکانیش لە هەڵەبجە ئەو قورساییەیان نەما.

منیش هەستام کۆمەڵێک فەقێم(٥ فەقێ) کۆکردەوە، لە سلێمانییەوە ڕۆیشتین بۆ بەغدا، چووین بۆ ماڵی موفتی ئەمجەد زەهاوی، وتمان ئێمە فەقێین خوێندنمان تەواوکردووە، وتی وەرەقەتان ئەدەمێ بچن بۆ لای یوسف گەیلانی با بتاننێرێت بۆ ئەزهەر لە قاهیرە. کاتێک ڕۆیشتین بۆ لای وتی من ناتوانم ئەم ساڵ بیاننێرم، ساڵی داهاتوو مراجەعە بکەن بەسەرچاو ئەتاننێرم. وتم بۆ نەچین بۆ لای عەبدولکەریم قاسم، نەموێرا بڵێم ئەیناسم، وتم لەوانەیە ئەو من نەناسێتەوە، چەند جارێ هاتووە بۆ خانەقین وەکو فەقێ منی دیوە، جامانە و کەوا و سەڵتە و ئەوانەم لەبەرا بووە لەوانەیە نەمناسێتەوە، ڕۆیشتین بۆ بەغدا، چووینە مزگەوتی مورادییە(حاجی موراد) شەو لەوێ خەوتین، بەیانی چووین بۆ (دیفاع)، کە چووینە بەردەمی (دیفاع) زابتەکە هات وتی مەمنووعە، وتمان ئێمە مقابەلەمان هەیە لەگەڵ زەعیما (عەبدولکەریم قاسم)، وتی با بچم پێی بڵێم، چوو بە زەعیمی گووت: پێنج فەقێی مەلای کوردەواری هاتوون ئەڵێن مقابەلەمان هەیە، وتی ڕاستەکەن با بێن، نەیخستین بەدرۆوە، کە چووینە لای ژوورێکی ڕەق و تەقی هەبوو، خۆی پۆشتە کردەوە، ئەمەی ئەیڵێم ١٩٥٩ بۆ ١٩٦٠ بوو، وتی چیتان ئەوێ؟ وتم لە ساڵی ١٧ی هیجرییەوە تائێستا ئەم کوردە داماوە گیری خواردووە بە دەستی مەلاوە، مەلا نانی ئەخوا، ئاوی ئەخوا، ژنی مارە ئەکا، مەلا بووە بە زەروویەک خوێنی ئەم خەڵکە ئەخوات، ڕزگارمان بکە لە مەلایەتی و بمانکەن بە شتێک، وتی چەند کەس ئەبن؟ وتم نزیکەی هەزار کەسێک ئەبین، لە هەموو کوردستاندا، ئەم هەزار مەلا بێ معاش، بە سەرفیترە و دوعا و نوشتە ئەژی، ئێمە ئەمەمان بەپێی حوجرەکان دانا بۆ نموونە لە هەڵەبجەدا ٢٠ حوجرە هەبوو، هەریەکەی ١٠ی بۆ دانێ ئەکاتە ئەوەندە، لە سلێمانی و قەڵادزێ و ڕانیە و هەولێر و ئاکرێ ئەوەندە. قاسم بانگی کردە وەزیری مەعاریف، ئێمەش دانیشتبووین، وتی تەلەفون بکە بۆ وەزیری مەعاریف، کە ناوی ئیسماعیل عارف بوو، با بێت بۆ ئێرە، کە هات قاسم وتی ئیسماعیل تەرتیبی ئەمانەم بۆ بکە، وتی چییان لێ بکەم، وتی ئەمانە عەرەبی ئەزانن ئەیانکەی بە مامۆستای عەرەبی، وەزیر وتی ئێوە بڕۆنەوە بۆ شوێنی خۆتان ئێمە لە

ئیزاعەوە ئیعلانی ئیمتیحانی بەکەلۆری ئەکەین، ئەوکاتە پۆلی شەش نەبوو، پۆلی پێنج بوو، پێنجی سانەوی مقابیل بە دوانزەی ئێستا، وتی ئێمە ئیمتیحانێکی پۆلی دوانزەتان ئەکەین ئەگەر ناجیح بوون دەورەتان بۆ ئەکەینەوە.

لە ڕۆژی ٣٠ی حوزەیرانی ١٩٥٩ ئەمر دەرچوو بۆ ئیمتیحانی بەکالۆری، ئێمەش چووین لە هەولێر ئیمتیحانماندا، لە مەجموعی ئەو ٧٠٠ مەلایە کە ئیمتیحانمان کرد تەقریبەن ١٢٢ کەسمان دەرچووین، لەوانەی کە دەرچوون و لەبیرم مابن ئەمانەبووین لە هەڵەبجە: مامۆشتا شێخ عەزیزی پاڕەزانی، مامۆستا بابا عەلی، مەلا سدیقی کوڕی مامۆستا عەبدولعەزیز، مەلا عەلی کۆکۆیی، مەلا عومەری ڕێشاوی، منیش یەکێک بووم لەوانە، دواتر دەورەیەکی یەک ساڵییان بۆ کردینەوە لە سلێمانی، مامۆستاکان بریتین بوون لە: عومەری مچە، مامۆستا فوئاد، شوکر مستەفا، مادەکانیش ئەمانە بوون، یەکەم صیحە، عیلم النفس، تەئریخی عێراق، ئوصولی فیقە، عیلمونەفسی تیفل.

لەکۆتایی دەورەکەدا سێ کەس یەکەم و دووەم و سێیەم بووین، بابا عەلی یەکەم بوو، لە سلێمانی دایاننا، مامۆستا شێخ عەزیز پاڕەزانی دووەم بوو لە هەڵەبجە دایاننا، من سێیەم بووم، لە سیروان دایاننام و بووم بە مامۆست، مەکتەبەکە دوجەیلەیان پێ ئەگووت.

**ململانێی پارت و تەحەڕوڕ:** ئەوکاتەی من لە خانەقین بووم دوو حیزب بە نهێنی و هەندێ جاریش بە ئاشکرا کاریان ئەکرد، ئەوانیش پارت و تەحەڕوڕ بوون، پارت پارتییەکان و تەحەڕوڕیش شیوعییەکان بوون، من پەیوەندیم لەگەڵ کەسێکی پارتییەکان هەبوو پێیان ئەگووت عەزیز پشتیوان، هاتووچۆم ئەکردن، بەڵام خەلایای سڕییان هەبوو، بۆ نموونە شەو دانیشتنیان هەبوو، چرایان ئەکوژاندەوە، لە حەوشەیەکدا یان لە شوێنێکدا دائەنیشتن تەنزیماتی حیزبیان ئەکرد، ئەوکاتە مەلا مستەفا لە دەرەوە بوو، پەیامی مەلا مستەفایان بە خەڵک ئەگەیاند، وەک: مەلا مستەفا سەلامتان لێ ئەکات، مەلا مستەفا وتوویەتی ئاگاتان لە خۆتان بێ، هەر دێمەوە ان شاءالله، حوکمەت نیازی خراپە. دواتر من گەڕامەوە بۆ هەڵەبجە، ئەوانەی ئەوکاتە لە هەڵەبجە قیادەی پارتییان ئەکرد بریتی بوون لە: ڕەئووفی حاجی حەمەعەلی، ساڵح هەژار، جەمال خەفاف، کەمال خەفاف...

شیوعییەکان لەوکاتەدا باوەڕیان بە کێشەی کورد نەبوو، ئەیانگووت کورد مقەوماتی ئوممەی تیا نییە، زمان و ئەرزی مووەحەدی نییە، لەبەرئەوە ئابووری مووەحەدیشی نییە، شرووتی ئومەی تیادا نییە، هەرچەند ئەمان ئەیانوت ستالین وای فەرموو، ئەوان ئەیانوت نا، مادەم لینین ئەفەرموێ هەر ئومەتێک ئەم پێنج شەرتەی نەبێ ئوممە نییە، کوردیش ئوممە نییە. ململانێی نێوان پارت و شیوعی لە ١٩٥٨دا گەیشتە ئەو ئاستەی شیوعییەکان حەمەی نانەوایان لە بازاڕدا پاڵ خست بۆئەوەی سەری ببڕن!! پارتییەکان

لاواز بوون، هەشت نۆ کەس بوون، لە ماڵی دکتۆر فوئاد بابان، ماڵی ئەحمەدبەگی سۆسەن، کە ئێستا کراوە بە مولحەقی مزگەوتی جامیعە، ئەوان لەوێدا کۆبوونەوەیان ئەکرد، کوڕێکی ئەحمەد بەگ هەبوو ناوی سەلاح بوو، نەخۆش بوو لە ماڵا کەوتبوو، پارتییەکی زۆر تۆخ بوو، ئیتر ئەو ئیشرافی کۆبوونەوەکانی ئەکرد، خەڵک بەناوی ئەوەی بۆ لای نەخۆش ئەڕۆن ئەڕۆیشتن بۆ ماڵیان کۆبوونەوەیان ئەکرد.

دوای ئەوەی کە من بووم بە مامۆستا، پارتیش ئیجازەی وەرگرت، من بووم بە ئەندامی ناوچەی هەڵەبجە، کاتێک شۆڕش لە ڕۆژی ١١ی ئەیلوول ١٩٦١ هەڵگیرسا، خەڵک چوو بۆ دەربەندیخان و شۆڕش شکا، ئیلتیحاقم کردەوە بە شۆڕشەوە تا ساڵی ١٩٦٤ پێشمەرگە بووین، مەسئولیەتم هەبوو، مقەڕمان لە هاوار و بیارە و تەوێڵە بوو، من بەشداری کۆنفرانسی ماوەتیشم کردووە، کە دواتر ئینشقاق تیایدا ڕوویدا..

**هێرشەکەی زەعیم صدیق**: ئەو کاتەی زەعیم سدیق هات، من جێگری مەسئولی ناوچەی هەڵەبجە بووم لە بیارە، لەگەڵ مەحمودی مەلا عیزەت و جەمال نامیق و فازیل تاڵەبانی و فازیلی حاجی کەریم لە بیارە بووین، کاتێک کە جەیش هات نزیکەی هەفتەیەک لە زەڵم شەڕ بوو، ئەوەی کە حەمە گوڵپی تیا شەهید بوو، لەو شەڕەدا تەقریبەن ١٧ شەهید و ٢٥ بریندارمان هەبوو، دواتر زەعیم صدیق هجومی هێنا بۆ بیارە، بەڵام لە بیارە شکا، کەمال سەلیمی خەڵکی سلێمانی کە ئامر مەفرەزە بوو بەهەڵە بەدەستی پیشمەرگەیەکی خۆی شەهید بوو، واتە یەک پێشمەرگەمان شەهید نەبوو لە بیارە تەنها کەمال نەبێ، ئەویش بەهەڵە بوو. کەمال کەسێکی ڕیازی بوو، جلی کوردی لەبەرا بوو، وەختی هەنجیر بوو، پێشمەرگەیەکی خۆی تەماشا ئەکات یەکێک بەسەر دارەکەوەیە، تەقەی لێ ئەکات و ئەویش شەهید ئەبێ. بەڵام لە هەڵەبجە کە زەعیم سدیق چووبوویە ناو شار، ژمارەیەک دوکانەکانی سووتاند، لەوانە دوکانی حەمەی مەلاکەریم و ڕەشەی مەلاکەریمی سووتاند، چونکە کتێبی کوردییان تیادا دۆزیبوونەوە، شیعری خۆیانی تێدا بوو، ئەوانەیان سووتاند. لەو هێرشەی هەڵەبجەدا تەنها دوو سێ کەس کوژرا. لە سەرەتاشدا ڕەشبگیری خەڵک هەبوو، بەڵام دواتر ئازادیان ئەکرد.

**مامەڵەی خراپی پێشمەرگە**: پێشمەرگە لە سەرەتای شۆڕشی ئەیلوولدا هەڵەی زۆریان بەرامبەر بە عەشایەر کرد، خەڵکیان چەک کرد و ئەزیەتیان ئەدان، بە زۆر ئەیانکردن بە پێشمەرگە، وەکو پەکەکەی ئێستا، ئیتر خەڵکێک بەتایبەتی جاشەکان لە ڕقی ئەوان کاری خراپیان ئەکرد بۆئەوەی سومعەی پێشمەرگە پێ بشکێ.

دەوڵەندەکانی شار: لە پیاوە دەوڵەمەندەکانی شار ئەمانە بوون: میرزا تۆفیقی عەبابەیلێیی باوکی ئەنوەر و کاوە و عەلی، حاجی عەفوور باوکی نووری و....، حاجی

فەتحوڵڵا، خێڵی حاجی حەمەعەلی ئەمانە دەوڵەمەند بوون. خەڵکی جاوورن. دەوڵەمەنەکانی هەڵەبجە دوکانیان هەبوو، زۆربەی دوکاندارەکان خەڵکی پریس و هانەسوورە بوون. بۆ نموونە مامۆستا مەلا شەفیق دوکانی کوتاڵی هەبوو، ساڵەح بانەیی دوکانی هەبوو، بانەییەکان هەشت و نۆ ماڵ بوون هەموویان دەوڵەمەند بوون. نازان ئەم بابەنەییانە کەی هاتوون بۆ هەڵەبجە لە عومری من و باوکیشمدا نەبوون، واتە پێشتر هاتوون.

**جولەکەکانی هەڵەبجە:** جولەکەکانی هەڵەبجە نزیکەی ٣٠ سی ماڵێک ئەبوون، من بە فەقێیەتی بینیومن، بەهاران ئەهاتن بۆ بامۆک، لەوێ چەقالەی سوێر و گوێزی سوێر و شتی نەواشفیان لەگەڵ خۆیاندا ئەبردەوە، مەمنوع بوو لە ڕۆژی شەممماندا ئاگر بکەنەوە، بەس نەواشفیان ئەهێنا، قەزوانی سوێر و گوێزی سوێر و کولیچەی ڕەنگاو ڕەنگ و... دائەنا بۆ خواردن. لەبەرئەوەشی بەگزادەی جاف کچی لێ مارەبڕیبوون، حوکمی ئاغایان هەبوو لە هەڵەبجەدا، ئەوە نەبوو مەواتنی دەرەجە دوو بن، بەگشتی تەعامولیان ئاسایی بوو.

لەڕووی کار و پیشەوە، جولەکەکان ئەغڵەبیان ئاڵتوون فرۆش بوون، کاری کوتاڵفرۆشی و عەرەق دروستکردن و خومخارییان ئەکرد، خومخانەیان هەبوو، ئەو کاتە باوی مەوج و جاجم و ئەوانە بوو، ڕەنگیان ئەکرد، ئینجا قوماش عایدی ئەوان بوو، خەیاتی خۆیان هەبوو. بۆ گۆشتیش، دەبوو یەعقوبی خۆیان حەیوانی سەربڕبڕییایە، چونکە گۆشتی هەموو کەسێکیان نەدەخوارد، گۆشتی چەور و بەزی ناوسکیان نەدەخوارد.

هونەری کەسابەتیان: عومەری حەمەصاڵح بانەیی شتێکی باوکی بۆ گێڕامەوە، وتی باوکم دراوسێ دوکانی کابرایەکی جولەکە بوو، حاتانیان پێ ئەوت، ئەیوت ئەو وەختە شەکر لە بەریتانیاوە ئەهات، بۆیە گران بوو، شەکرەکە زەرد بوو، کە ئەهات باوکم بە مانگێ بە دوو مانگ فەردەیە شەکری بۆ نەئەفرۆشرا، حاتان هەموو ڕۆژێ فەردەیەکی ئەفرۆشت، باوکم ئەیوت حاتان ئەوە چۆن ئەمە ئەفرۆشی، ئەیوت ئاخر بێ قەزا بی، من کیلۆکەی ئەدەم بە فلسێ کەمتر لە تۆ، خەڵک بۆ ئەم فلسە داماوە، ئینجا من لە ڕۆژێکا گونیەیەک ئەفرۆشم ڕووپیەکم بۆ ئەکات، کەواتە ئەگەر من ئیستفیادەی گوونیەکەم کردبێ ئەیفرۆشم، بەڵام تۆ بە گران ئەیفرۆشی بۆیە قیمەت ناکات.

جولەکە کتێبێکیان هەیە پێی ئەڵێن تەلمود، لە تەلمودا نەصیحەتیان ئەکات ئەڵێ: ئەی بەنی ئیسرائیلی هەمیشە با عیلاقەتان لەگەڵ زێڕ و زیووا هەبێت، یانی دۆستی ئەم دوو مەعدەنە بن، ئەم دوو کانزایە لە بەهەشتەوە هاتووە، ئاگاتان لەم دوو کانزا بێ، تەعامولتان لەگەڵ ئەم دوو کانزا بێ، لە سەرەتاوە تا کۆتایی ئەمە یەک، دووەم: دائیمە خۆتان بە زەعیف بزانن، بڵێن ئێمە موستەهدەفین، ئێمە زوڵممان لێ ئەکرێت، لێشتان نەدەن هەر بگرین، بڵێن ئەوا خوراین، یانی دائیمە هاوارتان لە بێکەسی هەبێ،

با بەقوەتیش بن، قوەتیشتان هەبێ هەر بە زەعیف خۆتان بدەنە قەڵەم، سێ: قووەتی خۆتان بە دوژمن مەڵێن، ئەوەم هەیە و ئەوەم ئەوەم نییە. هەرگیز مەیلێن، ئەگەر خۆیان ویستیان بزانن بابیزانن کەیفی خۆیانە، بەڵام هەرگیز قووەتی خۆتان بەدەمی خۆتان مەڵێن. جوولەکە ئەمەیان پەیڕەو ئەکرد.

**ڕۆیشتنەوەیان:** من لە بیرم دێ جوولەکەکان ئەشیاکانیان دەرئەهێنا، لەبەر قاپیەکەیان دایان ئەنا بۆ فرۆشتن، وەک پشتی و دۆشەک و لێفە و بەتانی و کەلوپەلی تر بە هەرزان، بە تالانی، خەڵک ئەیوت بەکەمتر نابێ، ئەیانوت بەخوا کوردێکی نەگبەتی تۆ لە ئێمەی ئەکڕی، ئەی کێ لە تۆی ئەکڕێ، من ئەو قسانەم لەبیرە.

**سەیرانیان:** جوولەکەکان بۆ سەیران و ڕابوارد ئەڕۆیشتن بۆ سەیرانگای گوڵان و گوندی بامۆک و عەبابەیلێ.

سەیرانی خەڵکی ئاسایی: سەیران بۆ ئەهالی هەر نەبوو، خەڵک ئەوەندە موحتاج بوو بە هاوین تووتن و مەرەزە و شەتڵ و حەیوان بەخێوکردنیان هەبوو، بە زستانانیشدا هەر خەریکی کا و دان و ئاو و بەخێوکردنی حەیوان بوون، ئەصڵەن ئاگایان لە سەیران و گەشت نەبوو.

**هەژاری**: لە زەمانی عوسمانیدا نەک هەر کورد و عێراق و عەرەب، هەموو شەرقی ئەوسەت بە عام فەقیر بوون، هیچیان نەبووە، بەڵام ئەم مەنتیقەی هەڵەبجە واڕێککەتبوو لەبەرئەوەی کەسایەتی زۆر بوو، حەیوانداریی و وڵاخداری ئەکرد، بۆ نموونە کاروانی هەڵەبجە ئەچووە ماهیدەشت گەنمی ئەهێنا، یان ئەچوو بۆ خانەقین خورما و خوێی ئەهێنا. لێرەوە تووتنی ئەبرد لەوێ ئەیگۆڕییەوە بە خورما و بە خوێ. خورما و خوێکە لێرە دووقات پارەی بۆ ئەکرد، هەروەها حەیوانداریی و گەرمیان و کوێستانیان ئەکرد، ئینجا خەلە و دەغڵودان بەشی خۆیان ئەکرد، لەبەرئەوە لە وڵاتی ئێمە فەقیری بەو مانایە نەبوو، بەڵێ کێچ و ڕشک و سپێ هەبوو.

**مەلا لەتیف و سەجادی:** مامۆستا سەجادی زۆر ڕەفیقم بوو، ژنەکەی خەڵکی خانەقینە، کچی مەلا حەکیمی بوێ و سەرهوێ بووە، بێسارانی لای مەنتیقەی ژاوەرۆ، سەجادی بەین بەین ئەهات بۆ ماڵی خەزووری لە خانەقین، کە ئەهات بۆ ئەوێ خەریکی کۆکردنەوەی ئەم قسە قۆڕانە بوو، بەین بەین ئەهات بۆ لای موفتی خانەقین مامۆستا مەلا ئەحمەد، ئەیوت مەلا ئەحمەد هاتووم ئەم فەقێتە قسەی زۆر خۆشی لایە، ئەیوت وەرە لای موفتیدا قسەی قۆڕم بۆ بگێڕەوە، منیش ئەو حیکایەتەی بامۆکەم بۆ دروست کرد، کابرایەکی هەڵەبجەیی، خەڵکی جانجان، ئەچێ بۆ ئەستەمبوڵ، کوڕێکی گەنجی قۆزی تازە پێگەیشتوو، بەحاڵ ڕیشی هاتووە، ئەچێ لە مەیدانی کارا لەوێ ژنێک بە دوو مناڵی

جوانیکله بە عەرەبانەیەکی شاهانا دێت، داوا ئەکات بە تورکی ئەڵێ گێل گێل(gel gel / وەرە وەرە)، ئەویش ئەڵێ ئەوە بە من ئەڵێی گێل، پێی ئەڵێچ هەتیو ئەوە بانگت ئەکەن، ئەڵێ وەرە سواربە لەگەڵماندا ئیشم پێتە، ئەیبا لە ماڵا باخچەی پێ ئەکێڵێ، کوڕ بازووی هەیە و ئەمیش مێردی دوو ساڵە مردووە و تەنها ئەم دوو مناڵەی هەیە، ئەڵێ هەر لێرا غورفەیەکت بۆ تەرتیب ئەکەم هەر لێرا ئیشم بۆ بکە و ئیشی بازاڕیشم بۆ بکە، منیش ئەو لوغەتی تۆ نازانم، بەڵام تۆ بەین بەین لوغەتی من فێربە، پاش شەش مانگ دەست ئەهێنێ بەخۆیا و دەوڵەمەند ئەبێ و تەرتیبات ئەکات، ژنەکە پێی ئەڵێ ئەزانی چی حەمەگیان جل و تەرتیبات و کەلوپەلت بۆ ئەکەم، ئەترازێنمەوە، ئەتبەم بۆ خزمەتی سوڵتان، بە سوڵتان ئەڵێم ئەمە برای مێردەکەمە، من ئەمەوێ ئەمر بفەرمووی لەگەڵ ئەم برای مێردەما زەواج بکەم، ئەوکاتە لێت ئەپرسێ چیت ئەوێ، ئەڵێی هیچ، پاشا سڵامەت بێ، سوڵتان گەورە بێ، دوای ئەوە ژنە مارە ئەکات و هەموو شتێ تەرتیب ئەبێ هەموو ڕۆژێ ئەڵێ ئاخ، ئەویش ئەڵێ چیت کەمە، ئەڵێ ئاخ بۆ بەڵبی برنج، ئەڵێ هەر ئێستا، ئەچێت لە دیوان، فەوجێ سوارە لەگەڵ خۆیا تەرتیبات ئەکا و لە ئەستەمبوڵەوە دێن بۆ شارەزوور، بۆئەوەی بزانن ئەم بەڵمە چییە، کە دێنە خواری سیروان، لای زەوییەکەی حاجی ئەوڕەحیمە دزە، تەماشا ئەکا بەڵمەکە هەڵدراوەتەوە و شەن ئەکەن، ئەمیش دائەبەزێ لە عەرەبانەکەی و تەماشا ئەکات خۆی گەوزاند بە بڵمەکەوە، ئەڵێ ئەوە چییە، ئاخم بۆ ئەمە ئەخواست، ئەڵێ برۆ هەر نەیەیتەوە لەگەڵما.

ئینجا ئەوەی دەرمانی کێچەکە، گەنجێکی تر بیست لیرە کۆئەکاتەوە، ئەپرسێ چی باشە لە شارەزوورا ئەڵێن دەرمانی کێچ. هەر بیست لیرەکە ئەدا بە دەرمان، بە ڕێگەی بەحرا دێت لە بەسرا دائەبەزێ و لەوێ بە ولاغ ئەیهێنێتەوە بۆ شارەزوور، ئەوکاتە زەمانی شێخ لەتیفی قازی ئەبێ، برای شێخ عومەری قەرەداغی، دەرمان دائەنێ لەبەردەم مزگەوتی پاشا، پیاڵەی بە مەجیدییەک، کابرایەکی بێژاوایی یا بەکراوایی دێت ئەڵێ پیاڵەیەکم بۆ بکێشە، پیاڵەکەی گەورە ئەبێ، ئەڵێ بیکە بە دوو، هەرزاڵە لا ئەبا و ئەیوەشێنێ، شەو کێچ دێتە بەیەنیان، بەیانی دێتەوە ئەڵێ سەگبابی بامۆکی، هەڕەشەی لێ ئەکات و ئەیبا بۆ لای شێخ لەتیف، کابرای بامۆکیش زۆر عاقڵ ئەبێ ئەڵێ قوربان لێی بپرسە ئەم کابرایە کە ئەم دەرمانەی لە من کڕی لێی پرسیم چۆن بەکاردێت، وتی نەوەڵڵا، لێم نەپرسی، وتی دەی وەڵڵا حەقی خۆیەتی، لێی بپرسە دەستووری عەمەل کردن بەم دەرمانە چییە، ئەڵێ قوربان ئەو کاتە پێم ئەوت کێچەکە بگرە دەرمانەکە بکەرە چاوی کوێر ئەبێ ئیتر ناگەزێ.

**نوسینەوەی یادداشت**: یاداشت ئەگەر نووسیبێتم ئێستا بڵاوی ناکەمەوە، دوای مردنی خۆم بڵاوی ئەکەمەوە، بە ئاری و ئاسۆم وتووە. لەو یاددشتەدا باسی تەئریخم نەکردووە،

باسی ئەزموونی ژیانی خۆمم کردووە، من کوڕە هەژارێک بووم، گەیشتوومەتە ئاستێک بووم بە حاکمی هەڵەبجە، وەختی خۆی بووم بە مودیری ئەوقافی سلێمانی، هەروەها ئەندام پەرلەمانی پارتی بووم، ئەو پلانەی کە وەرمگرتووە بە ئەزموونی خۆم وەرمگرتوون، وتوومە چۆنم وەرگرتووە، ئەوانەم باسکردووە، نەهاتووم مێژوو بنووسمەوە.

ئەزانی چیم نووسیوە، من مودیری ئەوقافی سلێمانی بووم، مەسعوود بارزانی هات بۆ سلێمانی، هەموو مودیر عامەکانی کۆکردەوە، من لە پاڵیدا دانیشتبووم، بارزانی ڕوویکردە هەمووی، ئەو کاتە فایەقەڕەش معاونی ئاسایش بوو لەگەڵ شاهۆدا، بە منی وت کاک مەلا لەتیف با ڕاپۆرتی ئەوقافمان بۆ باس بکات، ئەمە ساڵی ١٩٩٣ بوو، منیش وتم باشە، دەستم پێکرد، وتم جەناب هەرچی موڵکی ئەوقافە هەموویم ساغ کردووەتەوە، دوکان مانگی بە نیو دینار بووە، کردوومە بە مانگی دە دینار، بە پێنج دینار، موڵکی ئەوقافم هەمووی زیندووکردووەتەوە، ئینجا معاشی سێبەرم لابردووە، شوێنی وا هەبووە دە ئیمامی هەبووە هیچیان دەوامیان نەکردووە، هەموویانم لابردووە، خام نەبووە، خامم بۆ داناون، مزگەوتەکانم ڕێکخستووە، ئینجا مەدرەسەی ئەوقاف لە کەلار و و دەربەندیخان و هەڵەبجە و سلێمانی و رانیە و قەڵادزێ و کۆیە تەرتیبی قوتابخانەکانم هەمووی تەواو کردووە، ناوەندی و دواناوەندیم جیاکردووەتەوە، پەیمانگام جیاکردووەتەوە، بەکورتی، ڕاپۆرتێکم دووردرێژم بۆ خوێندەوە.

لەم کاتەدا مەسئولی لق لەوێ بوو، محی الدین ڕەحیم، وتی جەنابی بارزانی، مەلا لەتیف ڕاست ئەکات، هەرچی وتووە ڕاستی وتووە، تەنها عەیبێکی مەلا لەتیف ئەوەیە کە پارتی نییە، کاک مەسعوود وتی بۆ پارتی نییە، وتی هەرچی لقی چوار بیڵێ ئەو جێبەجێی ناکات، بەڕەحمەت بێ مولازم کەریم وتی مەلا لەتیف نەک هەر پارتی نییە، بەڵکو دژی پارتی ئیش ئەکات، دوای ئەوە دەرویش ئاغا وتی خۆزگایە هەر محارەبەی بکردینایە، ئەوەندەی خزمەتی یەکێتی ئەکات، ئەوەندە خزمەتی پارتی ناکات، منیش دەستم کرد بە گیرفانمدا، وتم جەنابی بارزانی، ئەمە وەرەقەی کاک فلان کەسە بۆ شوقە، ئەمە وەرەقەی کاک فلان کەسە بۆ فرۆشتنی زەوی ئەوقاف، ئەمە، ئەمە، وەلحاڵ هەموو وەسیقەکانم خستە ڕوو، وتم بە گوێی ئەم لقەم نەکردووە، کە داوای کردووە من غەششی بۆ بکەم، من مودیر ئەوقافی کوردم نەک هی پارتی، من هاتووم خزمەتی ئەوقاف بکەم، ئەوقافم تەنزیم کردووە، من قوتابخانەیەکم داخستووە، مولازم کەریم داوا ئەکات پەنجا تەلەبە، ئەوکاتە ئیخوان تەنزیمیان نەکردبوو، بەس هەر خەریکی ئیغاسە بوون، وتم من قوتابخانەم داخستووە لە مزگەوتدا، وتوومە هەرکەسێ قوتابخانەی دینی دائەنێ با لە ماڵی خۆیدا داینێ، نابێ لە مزگەوتدا داینێ، مزگەوتم مەنع کردووە لەمانە، ئینجا ئەوە

کلیلەکانی ئەوقاف، من پێویستم بە ئەوقاف نییە، من مامۆستام، زۆر لەسەری نەڕۆین کاک مەسعوود وتی کاکەگیان دەستت خۆش بێ، باشت کردووە، ئیتر ئاوا، ئەزموونی شەخسی خۆم نووسیوە، نەهاتووم مێژووی کورد بنوسمەوە.

هاوکاری پاشا و بەگزادەکانی جاف بۆ مزگەوت و قوتابخانەکان: من لەبیرمە حەسەن بەگی جاف دوای ئەویش وەسمان بەگی شەرەفبەیانی کە ئەویش بە حساب هەر جافە، ئەویش قوتابخانەی هەبوو، هەروەها حامید بەگ. مەسەلەن یارمەتی حامید بەگ بۆ پریس ئەوەبووە کە بە مامۆستا مەلا عەزیزی وت، جەنابی مامۆستا عەزیز خۆت وەرە پریس، مەلا سالحی ئامۆزات بێنە تریفە، کە هەردووکیان موڵکی منە، لە مەنتیقەی پێنجوێنەوە هێنانی بۆ پریس و تریفە، دواتر ئاشی حامید بەگی تاپۆ کرد لەسەر مامۆستا مەلا عەزیزی پریس، کە ئەو وەختە ئاش وارِیداتی هەبوو. ئەوە پریس، ئینجا ئەوە تریفە، جگەلەوەش عیلاقەی زۆریان لەگەڵ شێخانی بیارەدا هەبووە، مەسەلەن مەجید بەگی وەسمان پاشا لە بیارە دفنە.

ئەم عەشیرەتی جافە جگە لە دەعمی قوتابخانەی عەبابەیلێ، کە داود بەگ یارمەتی داون، ئینجا شێخ ڕەشید کە دۆستی داود بەگ بووە، ئینجا پێشی منیش قوتابخانەیان هەبووە لە قزرابات، مەحمود پاشا لەسەر قەبرەکەی خۆی قوتابخانەی دروستکردووە، حافزی گرتووە بە کرێ دوای خۆی قورئان لەسەر قەبرەکەی بخوێنێ.

مەحمود پاشا ماڵی ڕەسمی لە کۆکز بووە، مەرقەدی موبارەکی لەناو مزگەوتەکەی خۆیایەتی لە قزرابات(١). ئینجا ئەغڵەب کوژراوەکانی خۆیان بردووە لەوێ ناشتوویانە، قەبرەکانی مزگەوتی پاشای هەڵەبجەش هەموویان لە بەگزادەی جافن، بەڵام ئەحمەدموختار جاف خۆی وەسیەتی کردووە وتوویەتی لەوێ مەمنێژن و بمبەن بۆ عەبابەیلێ، چونکە ئینگلیزەکان دوژمنایەتیم ئەکەن لەوانەیە تەوهین بە گۆڕەکەم بکەن، بەڵام لە عەبابەیلێ ناتوانن.

**پەیوەندی حەسەن فەهمی بەگ لەگەڵ ڕۆشنبیران و زانایان:** ئەو کاتە حەسەن فەهمی بەگی جاف زۆر عیلاقەی بە نەریتی کوردەواریی هەبوو، تەرجەمەی کتێبە فارسییەکانی لە فارسییەوە بۆ کوردی ئەکرد، ئینجا زۆر عیلاقەی لەگەڵ ئەدیب و ڕۆشنبیرانەکاندا هەبوو، عیلاقەی لەگەڵ مەلا یوسفی گلێجاڵی و مامۆستا مەلا مەجیدی دەوڵەتئاوا هەبوو. ئەوکات

١. بەپێی بەڵگەنامەیەکی مێژوویی کە کاک هۆشمەندی حەسەن فەهمی بەگی جاف بۆ منی ناردووە، مەحمود پاشای جاف لە گوندی نێرگزەجاڕ کۆچی دوایی کردووە و دواتر لە قزرابات نێژراوە، ئەو گوندە دەکەوێتە ڕۆژئاوای شاری هەڵەبجە بە نزیکەی(١٠-١٥) کیلۆمەترێک لەسەر دەریاچەی دەربەندیخان هەڵکەوتووە. ئەو ڕۆژانە لای شێخ مارفی نێرگزەجاڕی بووە کە دۆست و خۆشەویستێکی نزیکی مەحمود پاشا بووە و هەر لە گوندەکەی خۆیاندا تەدریسی کردووە.

مامۆستا مەلا یوسف فەقێ بوو لە مزگەوتی تەکیە، هەتا بیروباوەڕی کوردایەتیشی هەبوو، مەلا یوسف دژی کوڕە شێخەکان ڕاوەستا بوو.

دوای ئەوە مامۆستا مەلا مەجیدی دەوڵەتئاوا(مەلا مەجیدی قووایی)، لە هەڵەبجە ئەیخوێند، لای مامۆستا مەلا عەزیز دەرسی ئەخوێند، بەڵام لە مزگەوتی تەکیە نیشتەجێ بوو، من منداڵ بووم، ڕۆژێک مامۆستا مەلا مەجید وتی: وەرە وەرە فەقێ بچکۆلەکە، دەتوانی بچی بۆ ماڵی حەسەن بەگ؟ دواتر وتی: ئەی ناترسی لە سەگ؟ وتم نەوەڵڵا ناترسم، وتی دەی بڕۆ ئەم نامە ببە بۆ حەسەن بەگ، کە چووم سەگەکان لێم وەڕین، کابرا هات، وتی ها فەقێ چیت ئەوێ؟ وتم نامەیەکم پێیە بۆ حەسەن بەگ، چوومە ژوورەوە و سەلاموعەلەیکم کرد، حەسەن بەگ و وەستا هاشم دانیشتبوون پێکەوە قسەیان ئەکرد، وەستا هاشم پیاو ماقوڵێکی ئێرانی بوو، هاتبوو بۆ هەڵەبجە لەوێ وەستای خانم بوو، نامەکەم دایە دەست حەسەن بەگ و وەستام، وتی چاوەڕێ مەکە، وتم مامۆستا فەرموویەتی جوابی نامەکەم، وتی: بە مامۆستا بڵێ ئەو کتێبە هی ئەوە نییە من بیدەم بەدەستی تۆوە، ئەوە کتێبێکی بەنرخە با خۆی بێت بیبات. کتێبەکە (تأريخ معجم ايراني) بوو، مێژووی فارسەکانی تیایە، جا مەبەستم ئەوەیە ئەمانە دائیمە مەربووت بوون بە قوتابخانەوە.

**مزگەوتی تەکیە:** سەید نەسروڵڵا کاتێ لە کەرکووک گەڕاوەتەوە، شێخ (عەبدالقادر) پێی وتووە بڕۆرەوە بۆ پاوە و خانەگا، بەڵام لە ڕێگا کە ئەگەڕێیتەوە بە شارەزوورا لە هەر دێیەک وتیان وەرە و لێرە بمێنەرەوە، لەوێ دانیشە و ژن بێنە، کە هاتووەتەوە لە گوندی بێژاوا لایداوە، خەڵکەکە کە ئەبینن ئەم کوڕە جوان و گەنجە مێزەرێکی بەستووە، زۆریان خۆشویستووە، وتوویانە فەقێ بۆ لامان نامێنیتەوە، ژنت ئەدەینێ و بۆ خۆت لێرە بیت، ئەویش وتوویەتی باش، لەوێ ژنی هێناوە. من ئەمەم لە مامۆستا مەلا عوسمان بیستووە ئەویش لە باوکی بیستووە، ماوەیەک لەوێ ئەمێنێتەوە، بەڵام بێژاوە زۆر گەرم ئەبێ، سەید نەسروڵڵا داوا خەڵکەکە ئەکات و ئەڵێ ئەوە بۆ نەچین لەو گردە ماڵێ بکەینەوە، کە ئەچنە ئەوێ ئەو کانی و ئاوە زیندوو ئەکەنەوە، ماڵی هاوینان ئەبەنە ئەوێ، ماڵی زستانەیان دێتەوە بۆ بێژاوا، هەر عەشیرەتەکە خۆیان، ئینجا ماوەیەکی پێ ئەچێ، هەڵەبجە تەکیەی تیا نابێت، جوولەکە و بنەماڵەی سیانزەی ماڵەی تیا ئەبێ، سەید نەسروڵڵا خۆی تەشریف ئەهێنێ بۆ هەڵەبجە، ئەم مزگەوتی تەکیە هەر بەناوی تەکیەی سەید نەسروڵڵاوە دروست ئەکات و ئاویشی لە بامۆکەوە بۆ ڕائەکێشێ.

مینبەر و قورئان و فەرمووده بە زمانی خۆیان بخوێنێتەوە و بڵێتەوە، ئەو کاتە کارێکی پەسەندە لە کۆڕەکەیدا زانا و دکتۆر و ئەندازیار و عەقڵە گەورەکانی کۆمەڵگە گوێی پێ بدەن و لە زمانی ئەوەوە بزانن شەریعەت چ دەستورێکی داناوە بۆ هەمووان.

بیهێنە بەرچاوی خۆت کەسێک عەرەبی نازانێ و سەری سوورڕ دەخوا لەنێو زانستەکانی پێویست بۆ تێگەیشتنی شەریعەت، بەڵام ئێمە (أصول الفقه) ی پێ دەڵێین، کە ئامانج لێی ئەوەیە ئەو کەسە ببێتە موجتەهید و فێر ببێ چۆن حوکم هەڵبگۆزێ لە دەقە پیرۆزەکان.

١١.هەست نەکردن وەک پێویستە، بەوەی: ئەو چینەی لە زانکۆ و پەیمانگاکاندا دەخوێنن، زۆرینەی هەرە زۆریان لە نێوان ١٨ بۆ ٢٤ساڵیدان، کەواتە هێزە بنیاتنەرەکەی داهاتوو و سەرچاوەی پێشکەوتن و داهاتووی کۆمەڵگە و پوختەکەی. چەند خەم سارديیە نە مامۆستا ئەو ستراتیجە لەبەرچاو بگرێ و نە قوتابی هۆشیار بکرێتەوە بۆ خودناسی. ئایا ئەزانی چ هێزێک لەو چینەدایە؟ یان دەزانی ئەو شوێنانە دوا فرسەتە بۆ دەرخستنی لێهاتووییەکان و ڕێنموونی کردن؟

١٢. خوێندنی ئاینی لەبەرئەوەی ڕاستەوخۆ پەیوەستە بە دەقە شەرعییە پیرۆزەکان، لە هەموو کایەکانی تر زیاتر دەبێت ئاگاداری حەڵاڵ و حەرام بن، هەم قوتابی و هەم مامۆستا و هەم سەرپەرشتیاران و کارگێڕییەکان، هەر جۆرە خەمسارديیەک لەو بوارەدا کارەکەیان تووشی خزان دەبێ و ناگاتە ئامانج.

ئەمانە دەروازەیەک بوون بۆ بابەتەکە، دەنا قسە زیاترە و هەتا هزر بهەژێنین زیاتر و زیاترمان پێ دەڵێ، ئەگەر وەک پێویست چارەسەریشمان نەوتبێ، ئەوە لەو باوەڕەداین کە دەستنیشانی ئاریشە و دۆزینەوەی نەخۆشی گرنگترە، بێگومان چارەسەر کۆمەڵێک عەقڵ کۆبنەوە بۆی، کارەکە پڕ بەرهەمتر و تۆکمەتر دەبێ، خودا هاوکارمان بێت.

ئەم زانایە خەڵکی سلێمانی بووە و لە ئەرشیڤی عوسمانیدا بە (سلیمانیلی) ناوی هاتووە و لە شاری بەغدا خوێندوویەتی و لە ساڵی ١٨٦٠ لە سلێمانی ئیجازەی زانستیی وەرگرتووە، لە ساڵی ١٨٦٧ بەهۆی نووسینی کتێبی (تحفة الملاذمین)ەوە، بۆ ئەوەی کتێبەکە پێشکەشی دەوڵەتی عوسمانی بکات هاتۆتە ئەستەنبوڵ. بەگوێرەی بەڵگەنامەکان تا ساڵی ١٩٠٩یش هەر لە ژیاندا بووە، بەڵام نازانرێ کەی و لەکوێ کۆچی دوایی کردووە. ناوبراو پلەوپایەی گەورەی ئیداری لە دەوڵەتی عوسمانی هەبووە. لەوانە موفتی مەرعەش و حیجاز بووە و دوازدە ساڵیش لە وەزارەتی مەعاریف کاری کردووە. ئەگەرچی شتێکی ئەوتۆ لەبارەی ژیانییەوە نەنووسراوە، بەڵام دوای بەدواداچوونمان لەنێو بەڵگەنامەکانی عوسمانیدا، چەند بەڵگەنامەیەک لەبارەی ناوبراوەوە بەرچاو کەوتن، لەوانە:

بەگوێرەی بەڵگەنامەیەک کە لە دۆسیەیەکی یازدە لاپەڕەی دایە و هەموو لاپەڕەکان تایبەتن بەم زانایە، لامیع شیعرێکی مولەممەعی بە سێ زمانی فارسی، تورکی و عەرەبی بۆ میدحەت پاشا (١٨٢٢-١٨٤٤ز)(١) نووسیوە، کە لە بەڵگەنامەکەدا هاتووە:

عەبدوڕەحمان لامع ئەفەندیی خەڵکی سلێمانی، تا ئێستا لە کاری مەئمووریيەتی خۆی بەردەوامە، ناوبراو هەر سێ کتێبی (لمعات الطارق، لب الفنون، تحفة الملاذمین)ی نووسیوە، لە مەرعەش و حیجاز موفتی بووە. چاوەڕێی لوتفی شەهەنشاهییە بۆ هاوکاریکردنی. لە لاپەڕەی تردا بۆ حەزرەتی میدحەت ئەفەندی مەنزوومەیەکی مورەککەبی فارسی و عەرەبی و تورکی لەچوارچێوەی قەسیدەیەکدا نووسیوە، لە کۆتاییدا نووسیویەتی ئەم

١. میدحەت پاشا لە ئەستەنبوڵ لەدایکبووە، لە منداڵیدا قورئانی لەبەر کردووە. جگە لە خوێندنی زمانەکانی عەرەبی و فارسی، زانستەکانی تری خوێندووە. لەو ماوەیەی کە لە ئەورووپا بووە زمانی فەرەنسی باشتر فێربووە. لە کۆتایی ژیانیدا، لە بابەتە ئایینییەکاندا قووڵتر بووەوە و ڕووی لە سۆفیگەری کردووە. ئەو لە بوارەکانی کارگێڕی، دادوەری، پەروەردەیی و ئەمنی لە ناوەند و ویلایەتەکانی ئیمپراتۆرییەتی عوسمانی خزمەتێکی زۆری کردووە. وەک دیوانی هومایون (١٨٣٤)، مەکتوبچی صەدارەتی عوزما (١٨٤٠)، یاریدەدەری نووسەر (دیمەشق-١٨٤٢)، نووسەری دادگا (قۆنیا-١٨٤٥)، نووسینگەی خەلافەت (١٨٥٠)، نووسەری دووەمی ئەنادۆڵ (١٨٥٣)، سەرۆکی نووسەرانی مەجلیسی ڤالا (١٨٥٩)، حاکمی نیس (١٨٦١)، والیی دانوب (١٨٦٤)، سەرۆکایەتی ئەنجومەنی دەوڵەت (١٨٦٨)، والیی بەغدا (١٨٦٩)، سەدری ئەعزەم (١٨٧٢: خولی یەکەم-سوڵتان عەبدولعەزیز)، والیی سەلانیکی (١٨٧٣)، والیی سوریا (١٨٧٨) و والیی ئایدن(١٨٨٠). لە کۆتاییەکانی ژیانیدا لەگەڵ بەرپرسانی دەوڵەتی عوسمانی ناکۆک بوو، بەهۆی هەڵوێستەکانییەوە بۆ تائیف دوورخرایەوە و لەوێ لە زینداندا خنکێنرا. بۆ زیاتر زانیاری بڕوانە:

Çetinsaya, Gökhan-Buzpınar, Ş. Tufan (2005). “Midhat Paşa”. İslâm Ansiklopedisi. C. 30 . İstanbul: Türkiye Diyanet Vakfı Yay. 7-11.

قەسیدە سەر و پێ شکاوە و عاجزانە لە نەزم و نووسینی عەبدوڕەحمان لامیعە لە ماڵی مستەفا پیاسلی و لە میوانداریی ئەودا نووسراوە.

لە لاپەڕەی دواتردا نامەیەکی (لامیع)ی تێدایە بۆ مەقامی سەدارەت و خەلافەت، کە تێیدا باسی ئەوەی کردووە کە یازدە ساڵی پێشوو و نۆزدە ساڵی پێشتر خەریکی عیلم و دانانی کتێب بووم، تا ئێستا کتێبەکانی (لمعات الطارق و لب الفنون و تحفة الملاذمین)م نووسیون و چەند ساڵ لە مەرعەش موفتیایەتی و لە حیجاز لە قائیمقامییەتدا کارم کردووە و هەروەها لە وەزارەتی پێشووش باشترین خزمەتم کردووە. ئێستاش دووچاری بژێویی و گوزەرانییەکی خراپ بووم و گوزەرانەکەم نەژی و نەمرییە و مانگانە چوارسەد و پەنجا قرووشم هەبوو، ئەویش نەماوە، جا داوا دەکەم یان خانەنشینم بکەن یانیش هاوکارییەکم بکەن. پاریش تەزکیرەم دابووە شووراى دەوڵەت، وەڵام نەبووە. مێژووی ئەم نامەیە ساڵی ١٢٨٩ی کۆچی (١٨٧٢ز) لەسەر نووسراوە و ناو و ئیمزای لامیعی بەسەرەوەیە.

نامەیەکی دیکەی ناوبراو لە شێوەی نامەی پێشوو هەیە و ناوەڕۆکەکەی بریتییە لە:

ئەم داواکەرە کە بێ سنوور لە بواری تەدریس و ئیفتا کاری کردووە و لە بەغدا تەخەرووجی کردووە و لە زاناکانی سلێمانییە، مەعلوومی (کەمال پاشا)ی وەزیری پێشووی مەعاریفە کە ئەم داواخوازە دوازدە ساڵان لە وەزارەتی مەعاریف خزمەتی کردووە و کتێبەکانی (لب الفنون) و (لمعات الطارق) و (تحفة الملاذمین)ی نووسیوە. جا ئەو کەمە مووچەیەی هەیبوو لە سەردەمی صەدری پێشوودا بڕدراوە، ئێستاش حاڵ و گوزەرانم خراپە و لە سنوور بەدەر پێویستیم بە هاوکاریی و مەرحەمەتە. بەڵکو بتوانن ببمەوە مەئموور لە قائیمقامییەت یان هاوکاری بکرێم.

ئەم نامەیەش لە ٤ی جەمادی یەکەمی ساڵی ١٢٨٩ی کۆچی (١٨٧٢/٧/١٠ز)نووسراوە و ناو و مۆری عەبدوڕەحمان لامیعی بەسەرەوەیە.

جارێکی تر لە ٧ی شەعبانی ساڵی ١٢٨٩ ی کۆچی (١٨٧٢/١٠/١٠ز)، نووسراو بۆ وەزارەتی ناوخۆ کراوە کە داواکارییەکەی (لامع)، یان حسێبکردنی خانەنشینییەکەیەتی و یانیش گونجاوە بۆئەوەی بکرێتە نائیب و پۆستێکی بدرێتێ.(١)

نامەیەکی دیکەی عەبدوڕەحمان لامع، بەڵام دوای نزیکەی سی ساڵە لە نامەکانی پێشووتری. واتە لە ساڵی ١٩٠٩ یە. لە نامەکەدا باسی کتێبێکی دیکەی خۆی دەکات بەناوی (تشریح الاسلام لعقلاء الانام). لە نامەکەدا کە ناو و ئیمزای خۆی بەسەرەوەیە؛ هاتووە کە:

---

1. ŞD. 2870–13

به فەزڵی خودای تەعالا و حیکمەتی هۆشیارانی دین و ئوممەتی پێغەمبەر و هەموو مسوڵمانان، ئێستا خەلافەتی گەورەی عوسمانی لە دەرەوە و ناوەوەدا بەرەو پێشکەوتن دەچێ لەڕووی ماڵ و بەدەن و گوتن و قەلەم و کەمالی صەداقەت و حوسنی نییەتەوە پێشکەوتووە. (دوای پەسنێکی زۆری عیلم و عولەمایان و هاوکاری و پشتیوانی سوڵتان عەبدولحەمید بۆیان) ئەم بەندە ناچیزە بە گرنگی زانیوە کە بەرهەم و نووسراوەکانمان ڕوو لە ئەوروپا و وڵاتانی ڕۆژئاوا بکات، لەو سۆنگەیەوە بەندە کتێبی (تشریح الاسلام لعقلاء الانام) نووسیوە و پێشکەشی مەقامی عالی خیلافەتی کردووە و (دیارە بە عەرەبی نووسیویەتی) و ناچار بووە نوسخەی دووەمی تەرجەمەی سەر زمانی تورکی کردووە و زۆری لا پێویستە بە زمانانی ئەورووپیش چاپ بکرێ، بۆیە ئەم بەرهەمەی بۆ ئەم مەبەستە پێشکەشی خەلافەت کردووە.(١) مێژووی ئەم نامەیەش ١٣٢٧/٤/٦ی کۆچی (دەکاتە بەرامبەر ١٩٠٩/٤/٢٧ز) یە(٢).

کۆی گشتی بەرهەمەکانی (بەپێی بەدواداچوونی ئێمە)، بریتین لە:

١-بشارة الخدام/ چاپکراو

٢-تحفة الملاذين (دەستنووس)

٣- تشريح الاسلام لعقلاء الانام (دەستنووس)

٤- لب الفنون (دەستنووس)

٥-لمعات الطارق (دەستنووس)

لە بەرهەمە چاپکراوەکانی تەنیا ئەم کتێبەی خوارەوەیە:

-بشارة الخدام

لەبارەی ژیان و بەرهەمی ئەم زانایە، بە گوێرەی پەڕاوێکی کتێبخانەی شارەوانی گەورەی ئیستەنبوڵ بە ژمارە ٥٤٢٠٨ تەنیا بەرهەمی بشارة الخدام ی هەیە. هەروەها

---

1. Y..EE..143-17

٢. نووسەری ئەم وتارە بەهاوبەشی لەگەڵ د. محمود گیدەر لە ساڵی ٢٠٢٢ بە زمانی تورکی توێژینەوەیەکی ئەکادیمی لەبارەی (عەبدوڕەحمان لامع و قەسیدەکەی بۆ میدحەت پاشا) لە گۆڤاری (Littera Turca Journal of Turkish Language and Literature) بڵاوکردۆتەوە.
بڕوانە:
Abdurrahman Lâmi' Efendi'nin Midhat Paşa'ya Yazdığı Mülemma Kasidesi Üzerine Bir Değerlendirme .Mahmut Gider, Hemin Omar Ahmad, Littera Turca Journal of Turkish Language and Literature, Cilt 8, Sayı 1, 2022, 127 - 144



له کتێبخانەی زانکۆی ئەستەنبوڵ ناوی بە سولەیمانیەلی عەبدوڕەحمان لامیع هاتووە، ئەنجا ناوی کتێبەکەی نووسراوە.

ئەم کتێبە ئەگەرچی چاپخانەکەی نادیارە. لە کتێبخانەی شارەوانی گەورەی ئەستەنبوڵ پارێزراوە و زانیارییەکانی بەم شێوەیەی خوارەوەن:

ئەم کتێبە کە دەربارەی ئایینە بەگشتی، شانزە لاپەڕەیە و لەکۆتاییدا ساڵی نووسینەکەی نووسراوە کە ساڵی ١٢٨٨ی کۆچی (١٨٧١ز)یە، ئەم ساڵە لە بەرگی کۆتاییش نووسراوە، بێ ئەوەی ئاماژە بەناو و شوێنی چاپخانەکە بدرێ.

لە کتێبخانەی شارەوانی گەورەی ئەستەنبوڵ بەم ژمارە ٢٩٧,٠٤ ABD ١٢٨٨ ١٨٧١/H و زانیارییانە پارێزراوە:

قەبارە: ١٤X٢٠ سم، لاپەڕە: ١٦

ساڵی چاپ: ١٢٨٨ک/ ١٨٧١ ز

شوێنی چاپ: ؟ چاپخانە: ؟

هەروەها لە کتێبخانەی زانکۆی ئەرزەڕوومیش بەکۆدی (٠١٠٧٧٠٨)بەم شێوەیە تۆمارکراوە:


K-1254
T-297.73
بسم الله الرحمن الرحيم
ATATÜRK ÜNİVERSİTESİ

کتێبەکە بە زمانی تورکییە و لە چەند بەشێک پێکدێت، لە بەشی یەکەمدا باسی ڕوونکردنەوەی چەند فەرموودەیەکی پێغەمبەر دەکات. بەشی دووەم باسی پاداشتی خزمەتکار لە بەرامبەر خزمەتی ئاغایەکەیە و بەشی دواتریش باسی پێشەوایانی ئایینە. لەکۆتاییدا بەنیو پەرەگراف بە زمانی عەرەبی کتێبەکەی تەواو کردووە، بەم شێوەیە: لقد وقع الفراغ من هذه الترجمة بالتماس الامجدين الاكرمين طلبى الافعال الرضية وراغبى الخصال المرضية حضرت بشير آغا برنجى وحضرت امين آغا ايكنجى اغوات حضرت دولتلو عبد الحليم پاشا على يد اقل الورى

مترجمه تراب اقدام العلماء عبد الرحمن لامع، السليمانية مولدا، فى سنة ١٢٨٨ سابع عشر جمادى الاخر من الهجرة المحمدية فى بلدة قسطنطنية.

بەمشێوەیە دەردەکەوێت کە ناوبراو لەدایکبووی شاری سلێمانییە و ئەو کاتەی کتێبەکەی نووسیوە دانیشتووی شاری ئەستەنبوڵ بووە.

٢-تشريح الاسلام للعقلاء الانام:

ئەم کتێبە دەستخەتە و تەنیا لە کتێبخانەی زانکۆی ئەستەنبوڵ کەوتە بەرچاو، ١١٩ لاپەڕەی ٢٨ بە ١٩سانتیمییە و بە زمانی تورکیی عوسمانی نووسراوە و پێناچێ دواتر چاپکرا بێ. بابەتی کتێبەکە لەبارەی ئوسولی فیقهی ئیسلامییە. لە کتێبخانەکە بەم ژمارەیە NECTY٠٤٦٥٣ و لە ڕەفەی XX (١٨٩٥٩١٧,١) تۆمارکراوە.

ئەم بەرهەمە پێرست، پێشەکی و حەوت بەش و حەڤدە بابەت لەخۆدەگرێت. لە بەشی یەکەمی ئەم بەرهەمەدا کە بابەتەکانی پەیوەست بە بواری فیقھ پێناسە و تێگەیشتن لە عەقڵ لەخۆدەگرێت، لە بەشی دووەمدا حیکمەتی پەرستنی ئایینی و سوودەکانی بۆ شارستانییەتی ئیسلامی، لە بەشی سێیەمدا بازرگانی، کشتوکاڵ و هونەر، فەرز و سوننەتی وەک ڕۆژوو و نوێژ، لە بەشی چوارەمدا بەرژەوەندییەکان، لە بەشی پێنجەمدا حیکمەتی پشت قەدەغەکردنی خواردنەوە کحوولییەکان، لە بەشی پێنجەم ڕەفتارە قەدەغەکراوەکانی وەک کوشتن و بریندارکردن ڕوون کراوەتەوە. حیکمەتی قەدەغەکردن و سزادان لە شەریعەتی ئیسلامیدا و سوودەکانی بۆ شارستانییەتی گشتی لە بەشی شەشەمدا و، لە بەشی حەوتەم حیکمەتی دەستبڕینی دز و چەند مژارێکی تر قسەی لێ کراوە.

## سەرچاوەکان:


Çetinsaya, Gökhan-Buzpınar, Ş. Tufan (2005). “Midhat Paşa”. İslâm Ansiklopedisi. C. 30 . İstanbul: Türkiye Diyanet Vakfı Yay. 7-11.

Gider, M. & Ahmad, H. O. (2022). ABDURRAHMAN LÂMİ‘ EFENDİ’NİN MİDHAT PAŞA’YA YAZDIĞI MÜLEMMA KASİDESİ ÜZERİNE BİR DEĞERLENDİRME . Littera Turca Journal of Turkish Language and Literature , 8 (1) , 127-144

ŞD. 2870-13
Y..EE..143-17

عەبدوڵڵا عەباس



# تایبەتییەتی ئیسلامی کوردستانی

## مامۆستا مەلاکاکە حەمەی چوارتا و
## مامۆستا عومەر مەولود دیبەگەیی بەغدا بە نموونە

لە نزیکەوە (دوو زانای ئیسلامی) لەوکاتەوەی لە قۆناغی سەرەتایی خوێندندا بووم سەرنجیان ڕاکێشاوم و لە تەمەنی کامڵبووندا لە تاوتوێی دنیا و ژیان و نووری ئیمان کاریگەرییان لەسەرم هەبووە، هەتاکوو بگەمە قەناعەتی ئەوەی ئایینی ئیسلام و ماناکانی و بەلایەنی ڕۆحیی و ماددییەوە (پەیامێکی پیرۆزی شارستانیەت و ئازادی بەرپرسانەی ئینسانە) و ڕێوڕەسمی نواندنی ئەو مانایەش باوەڕی باڵای ئینسانی موسڵمانە بەوەی کە ئاڕاستە مەشهورەکەی پەیامبەرەکەی (د.خ) (إنما بعثت لأتمم مكارم الأخلاق) لە هەموو هەڵسوکەوتەکانی پەیوەست بە سیستەمی ژیانی کۆمەڵایەتییەوەیە ڕەنگبداتەوە، هەربۆیە لەو وەختەوە لە هەر باس و خواستێکا پەیوەندی کەم یان زۆری هەبێ بە ئیسلامەوە ڕستەی (پەیامی شارستانی و بینای ئینسانی ئازاد) بەکاردێنم.

له درووستبوونی ئەو قەناعەتەوە، لەسەر ئەو دیاردەیە دەوەستم کە زۆری پەلاماردانی ئەو پەیامەیە کە تاقانەیە لەوەی (پەلامارەکە ) هەمەجۆرە، هەمە ئوسلوبە و پێداگرتنی ڕێکخراو دڕندانەی خاڵی لە هەموو مانایەکی ئەخلاقە دەکرێتە سەر ئەو پەیامە و، نەیارەکانی پەیامەکە هەرەسی ئەخلاقیان گەیشتۆتە ڕادەیەک لایان وایە کە ئەو پەلامارە دڕندانەیە بەئاسایی دەزانن بەنیسبەت ئێمەوە. گەلی کوردستان لەگەڵ ئەوەدا کە ئیسلام و مەنزڵگاکانی ئیسلام: حوجرە و مزگەوت و مەزارە ئاینییەکان و کەسانی ناسراو بە زانای ئیسلامی دەوری پێشڕەویان هەبووە لە هەڵمەتی هوشیاری ئایینی شانبەشانی ئەوە دەوری سەرەکیان هەبووە لە ڕووناکی خستنە سەر هەستی نەتەوەیی ئینسانی کورد و هاندانی بۆ دەستبەرنەدان لە خاسیەتی نەتەوەیی، ئەوان بوون ژیرانە ئەو ئینسانەیان هوشیار کردووەتەوە کە ئایین و پەیامەکەی ئیسلام هاوشانی دەستگرتنی بە باوەڕانەیە بە خاسییەتەکانی کوردبوون و بەندوبالۆرەی ئەمیان دینییەوە حەقی دەستخستنەکاری خەباتی نەتەوەوەی نیە، هەربۆیە وادەکەن، چونکە ئارەزووی چۆڵکردنی مەیدانی زامنی خاسیەتەکانی نەتەوە بۆ ئەوان بمێنێتەوە هەتاکوو سیاسەت بگۆڕن بە بازرگانی وەک ئێستا وایە.

کە سەرنج لەم دیاردەیە ئەدەی، دیارە بەشێوەیەکی مەدروس و کۆک لەم عەسری بەخێرایی بڵاوبوونەوەی دیعایە و ناووناتۆرەنان لە بەرامبەر، ئاگری هەرەسی ڕەوشتی لە دنیا بەرداوە، ئەوانە دێن و هەرچی کەلتووری کۆلکە مەلاکان و عەمامە بەسەرەکانی ناو کۆمەڵە موتەخلیفەکان ئەکرێ و ئەوترێ دەیکەن بە ماددەی هەرزانی تانەدان لە پەیامی پیرۆزی ئیسلام (١)، ئەم ئوسلوبەش دەقاودەق ئوسلوبی خەتەرترین بزووتنەوەی شەڕانییە کە بزووتنەوەی زایۆنییە و ئیدیعای میراتگری پەیامەکەی موسا دەکات، کە ئەگەر بۆ نرخدانی باڵای ئەو پەیامە بگەڕێی تەنیا لە قورئانی ئایینی ئیسلامدایە.

لەلای ئێمەی کورد (بەبێ موناسەبەت) هەر ناوبەناوێک لەڕێگەی ئەم وەسیلە عەسرییانەی ناوی (تەواصلی ئیجتماعی پی ئەڵێن) ڕابەری تورکیا ئەردۆغان ڕاگەیاندنێک دەربارەی وەزعی حکومەتەکەی لەگەڵ خەڵکی کوردستانی باکوور ڕادەگەیەنی (گەجەروگوجەری لای خۆمان) دەست ئەکەن بە جنێوی دەمپیسانە بە ئیسلام و پەیامەکەی هەر لەبەرئەوەی ئەردۆغان ئیدعای ئیتیجاهی ئیسلامی ئەکات، ئەوانەی لە کۆمەڵی ئێمەدا قسەی نارەوا بە پەیامی ئیسلامی ئەڵێن و دوایی بەناوی سەربەستییەوە داوای لە گرێژنەبردنی ڕەوشت ئەکەن و بەرگرییان لە (سەربەستی حەیوان لاباشترە لە بیناکردنی مزگەوت)، ئەوەش ئەو نەگبەتیەیە کە تووشی میللەتێکی کڵۆڵی وەک ئێمە بووە، باسی مەشخەڵ ڕووناکەکانی ئیمان بوون بە پەیامی ئیسلام لە ژیانی نەتەوەی

کورد ناکەن کە ئەوان ڕووناکی هوشیاری ئینسانیان هێنایە ناو ژیانی کوردەوە (مەلا کاکەحەمە کە شار و گوندی کوردستانی تەی ئەکرد تا خوێنەواری بڵاوبکاتەوە) باسی ئەو زانا ئیسلامییانە ناکەن ئەوان هانی خەڵکیان ئەدا کچان بخنە بەر خوێندن، باسی ئەوە ناکەن کە پیاوی گەورەی وەک مەلا عەبدولکەریمی مودەڕیس و مەلای گەورەی کۆیە و نەوەکانیان مانای هوشیاریی و سەربەستیان فێری کوردان کرد. لە شارۆچکەی چوارتا مامۆستایەکی زانا دیسان ناوی (مەلا کاکەحەمە بوو – باوکی ئەمجەد) ئەو لاوانی چوارتای هان ئەدا کە هەر فرسەتێکی ڕووناکی ڕەوشت و هوشیاریی و سەربەستی بەرپرسیار دێتە ڕێیان لەدەستی نەدەن، چونکە ئەوەیە پاشەڕۆژمان بەسەربەستی زامن ئەکات، ئەو هەڵوێستە جوانەیم لەبیرناچێتەوە کە بەرامبەر کابرایەکی مەسیحی نواندی تاقانە مەسیحی بوو لە چوارتا، ئەو هەڵوێستەی ئەو منی لەو تەمەنە (قوتابی پۆلی شەشی سەرتایی) گەیاندە ئەو بڕوایە، کە پەیامی ئیسلام یانی پەیامی ڕازیکردن بە ئیختیاری ئینسانی بەسەربەستی نەک زۆرە ملێ.

لە چوارتا پیاوێکی مەسیحی و هاوسەرەکەی ئەژیان، کابرا ناوی (پۆلیص) بوو خەڵکی چوارتا بە مام پۆلیس) بانگیان ئەکرد، لە دائیرەی (بەیتاڵ) ئیشی ئەکرد، مامۆستا مەلا کاکەحەمە لە قوتابخانە وانەی ئایینی پێ ئەوتین، ئامۆژگاری ئەکردین نوێژ بکەین، هانیشی ئەداین هەتا بۆمان ئەگونجێ لە مزگەوت نوێژ بکەین، بەندە تەنیا بۆ نوێژی ئێواران ئەچووم بۆ مزگەوت، سەعات کەمتر بەر لەنوێژ ئەچووم مامۆستا ئەهات و پیاوانی مزگەوت لە دەوری کۆدەبوونەوە و پرسیاری دنیایی و ئایینی و وەزعی خەڵکیان لێ ئەکرد، لە بیرمە ئێوارەیەک کابرایەک بە حاجی ڕەسوڵی ئارد (٢) بەناوبانگ بوو بە مامۆستای گووت: ئەرێ مامۆستا گیان ئەوە جەنابت بۆ ئەو مام پۆلیسە گاورە بانگ ناکەیت و بیکەی بە موسڵمان لەسەر دەستی جەنابتا شایەتمان بێنێ؟ ئەی ئەو کابرایە بۆ بەتاق و تەنیا مەسیحییە لەناوماندا، ئەجرەکەشی بۆ جەنابت ئەبێ!

مامۆستا لێی پرسی: مام پۆلیس و ژنەکەی کارێکیان لی وەشاوەتەوە لەگەڵ نەریتی ئێمە نەگونجێ؟ حاجی وتی: حەدی چیە! مامۆستا وتی: ئەگەر خواپەرست و نیەت پاک نەبووایە و باوەڕی بە سەلامەتی ژیانی خۆی نەکردایە لە سایەی ئیسلامدا لەناوماندا نەدەژیا، هەتاکوو ئێمە وەک ئێستا مامەڵەی لەگەڵ بکەین زیاتر ئێمەی خۆش ئەوێ، بەڵکو ڕۆژێ خوا هیدایەتی بدات و خۆی ئیمان بە پەیامی ئیسلامی بێنێ، ئەوە من پێتان ئەڵێم کەستان بۆتان نییە وا مامەڵەی لەگەڵ بکەن دەلاقەی ناکۆکی لە بەینی ئیمانی خۆی و ئێمەدا سەغڵەتی بکات!!!

مامۆستای دووەم، مامۆستا عومەر مولود دیبەگەیی کە بەرنامەی وتاری ئایینی

ڕۆژانی هەینی لە ڕادیویی کوردی لە بەغدا پێشکەش ئەکرد، یەکێک بوو لەو هەرە ڕووناک فیکرە ئیسلامییانەی کە لە هەموو وتارەکانیدا و لە هەڵسوکەوت و کاریدا (ئیمامی مزگەوتە مەشهورەکەی حەیدەرخانە بوو لە شەقامی ڕەشیدی بەغدا)، لەڕادیویێش هەینی وتارەکانی ڕاگەیاندنی مانای حەقیقی هەموو ڕووناکی پەیامی ئایینی ئیسلامی، ئایینی شارستانیەت و بینای پەروەردەیی ئینسانی ئیسلامی گونجاو بوو لەگەڵ هەموو بیناکارییەکدا خزمەت بە ئینسانیەت بگەیەنێ...

ئەوەی هانیدام بۆ کردنەوەی دەرگای ئەم باسە و ئەو دوو ڕەمزە شەخسییانەی ئیسلام لە کۆمەڵی خۆماندا ئەوەیە خوێندنەوەی مێژووی ئیسلام لە کوردستان لە ماوەی شەخسە دیار و ڕابەرەکانییانەوە لەناو هەموو نەتەوەکانی ڕۆژهەڵاتی ناوەراست نەتەوەی کورد و ڕەمزە دیارەکانی ئیسلام وەک نووسەرێکی ڕۆشنبیری خۆمان لەم دواییەدا نووسیبووی: کورد ئایینی ئیسلامی نەکردووە بە پەیامی پەلاماردانی کەس و داگیرکردنی ئەرز و خەڵکیان، بەڵام دەستگرتنیان بە پەیامی ئیسلامەوە هانیداون بۆ ڕابەریکردنی خەڵکی کوردستان لەپێناوی ئازادی نەتەوەییدا، ئەوە شێخی بارزانی بەرەنگاریی عوسمانییەکان، ئەوە شێخ مەحمودی نەمر و ئینگلیز و ئەوە شەهید قازی محەمەد، دەیان نموونەی دی لە هەڵوێستی ئەو ڕەمزە ئایینییانەدا ئەوسا و لە ڕەمزە هوشیارەکانی ئێستایش نموونەی ئیسلامیی لە کۆمەڵی کوردستانیدا هاندەری هوشیاریی و بانگخوازی ئازادیبوون.

ئەو ڕەوتە ئیسلامییە توندڕەوانەی لە ناوچەکەدا سەریانهەڵداوە نیسبەتی بەشداریی کوردستانی بە پێوانە لەگەڵ نەتەوەکانی دی ناوچەکە کەمترە لە نیسبەتی ٣٪ی بەشداربوونی کوردستانی، ئەما ئەوەی هەندێ نەیارانی ئیسلام دەیکەنە بیانوو بەرئەنجامی ئەوەیە یان بیانووەکانیان هەڵسوکەوتی موتەخەلیفەکانە کە بەناوی ئیسلامەوە هەرکەسەیان خۆی دەکاتە فتواچی یان هەر لە خۆیەوە حەز ئەکات لەگەڵ شەپۆلی عەولەمەی غەرب هەڵسوڕێ تا بە موتەخەلیف حساب نەکرێ.

ڕایەکی دی شەخسی بەرامبەر هەوڵی شێواندنی وێنەی ئیسلام حیزبە ئایینییەکانی کوردستانە، بوونی چوار حیزبی سیاسی بە دروشمی ئاڕاستەیی ئایینی ئیسلامەوە وەک چەند جارێ لە باسی ئەم دیاردەیەدا ئیشارەتم پێداوە:

١- ژمارەی دانیشتوانی هەرێمی کوردستان بە ناوچە دابڕاوەکانەوە بابڵێین ٦ ملیونە، نیسبەتی هەرە زۆرمان موسڵمانین، نیسبەتی ئەوانەی ڕێوڕەسمی ئایینی ڕۆژانە ڕایی ئەکەن دەگاتە زیاتر لە سەدا چلی دانیشتوان، ئەمێنێتەوە لەسەدا شەستی خەڵک زیاتریان لەسەدا سی باوەڕیان بە ئینتما دینییەکەیان هەیە و ڕێزی باوەڕی ئیماندارانەی گەلەکەیان

دەگرن، ئەو نیسبەتەی دی ئەمێنێتەوە مەترسیان نییە بۆ سەر ڕێبازی ئینتیمای زۆربە بۆ ئایینی ئیسلام.

٢- نەتەوەی کورد بەگشتی کێشەی تایفەگەری نیە، لایەکیان لەوەی دی سڵ بکاتەوە و پێویستی بەخۆڕێکخستنی هەمەلایەن بێ.

٣- دوا شت زۆربەی خوێنەواران و هوشیارانی کورد باوەڕیان بە حوکمی مەدەنی هەیە، کەواتە پێ دەچێ تاقە هوکاری بوونی ئەم فرەحیزبیە بەناو و ناونیشانی ئیسلامەوە ململانێی سیاسی درووستی کردوون کە ڕابەرانی (سیاسی- ئایینی) کردوویانە بەوەسیلەی گەیشتنە مەرامی سیاسی، کە ئەمە ململانێیەکی سیاسی ئایینی لە کۆمەڵی کوردستانیدا دروستکردووە سیاسییەکانی عەلمانی زیاتر سوودیان لێوەرگرتووە لەوەی حیزبە ئاینییەکانی سوودی لی ببینن، بەڵکو لە هەندێ وەرچەخانی گەورەدا حیزبە ئیسلامییەکان ناچاری مساوەمە دەبن لەو وەرچەرخانانەدا، نەتیجە زیان لە ئاڕاستەکانی پەیامی ئیسلامی ئەدا وەک ئایین و پەیامی فراوانتر لە ڕوانینی نەتەوەیی.

(١) وەک ڕۆژنامەنووسێک کە بۆ مەبەستی دەوڵەمەند کردنی زانیاری سەبارەت بەو باس و بابەتانەی لەسەریان ئەنووسم، لە سەرچاوە ئاگادارەکانەوە (ڕۆژنامە و کتێب و مەوقعی ڕاگەیاندنی ئازاد و هەتا سەرچاوەی مێژوویی) دەرکەوتووە کە ئەو هەموو ڤیدیوێ و هەواڵ و ڕووداوانەی بەنیازی تانەدان لە پەیامی ئیسلامی بڵاودەکرێنەوە، دەست و ئیرادە و سەرمایەیەکی زۆری ڕۆژئاوا بەگشتی و سەرچاوەی بڕیاری ئەمەریکی و زایۆنی و بەریتانی لە پشتەوەیە و بەشێوەیەکی ڕێکخراو وردەکاری پارەی بۆ خەرج ئەکەن و بڵاوی دەکەنەوە.

(٢) حاجی ڕەسوڵ لە پیاوە ماقوڵەکانی چوارتابوو، کە نانەواخانەی تایبەتی لەوێ کرایەوە ئیجازەی نانەواخانەکە و هێنانی ئارد ئەو بوو بەوەکیلیی و ئیتر وەک باوە لای خۆمان کار و پیشە ئەکەن بەنازناو، ئەویشیان لە حاجی ڕەسوڵەوە کرد بە حاجی ڕەسوڵی ئارد!



دارِشتنەوەی: هەژار حاتەم

# سەنتەری زەهاوی دیدارێکی ڕاوێژکاریی لە بارەی ڕەهەندەکانی لادانە سرووشتییەکان لە کۆمەڵگەی کوردیدا سازکرد

ڕۆژی پێنجشەممە ٢٠٢٢/١٢/٢٢ لە شاری سلێمانی، بە ئامادەبوونی دەستەبژێرێك لە ئەکادیمیست و شارەزایانی بوارەکە، سەنتەری زەهاوی بۆ لێکۆڵینەوەی فیکریی، دیدارێکی ڕاوێژکاریی لەژێر ناونیشانی: «ڕەهەندەکانی لادانە سروشتییەکان لە کۆمەڵگای کوردیدا و چۆنیەتی بەرەنگاربوونەوەی» سازکرد. لە سەرەتای دیدارەکەدا، د. حسێن محەمەد بەناوی سەنتەری زەهاوییەوە، بەخێرهاتنی ئامادەبووانی کرد و گووتی: هیوادارین ئەم دیدارە ببێتە نەخشەڕێگایەك بۆ هەموو ئەو لادانە کۆمەڵاتیی و ئەخلاقییانەی، کە ئێستا کۆمەڵگەی تەنیووە. وتیشی: دیدارەکە لە دوو تەوەر پێکهاتووە، تەوەری یەکەم کاك د. دیاری ئەحمەد ئامانج و مەبەستی سەنتەری زەهاوی لە سازکردنی ئەم دیبەتە دەخاتەڕوو، لە تەوەری دووەمیشدا کاتی زیاتر بۆ ئێوە بەجێدەهێڵین، کە بەسەرنجەکانتان بابەتەکەمان بۆ دەوڵەمەند بکەن.

دواتر د. دیاری ئەحمەد دەستی بە قسەکانی کرد و وتی: هەموو کۆمەڵگە و شارستانێتییەک بایەخی گەورەی بە ڕەوشت داوە، بێگومان ئایینی ئیسلامیش زۆر زیاتر لە شارستانێتییەکانی تر گرنگی بە ئەخلاق داوە، کە بەردی بناغەی کۆمەڵگایە، پێغەمبەر (د.خ) دەفەرموویێت: **(إنما بعثت لأتمم مكارم الاَخلاق)**، هەربۆیە بەڕاستی ئەخلاق لای ئیسلام لە بابەتە نەگۆڕەکانە، بەڵام بەداخەوە ئێستا لەلایەن ژمارەیەک کەس و دامودەزگاوە، چەند بابەت و پرسێک، لەوانە (جێدەر و هاوڕەگەزبازیی) دەوروژێنرێت، کە زۆر دوورە لەو ئەخلاقەی، کە وتمان کۆمەڵگەکانی لەسەر بنیاتنراوە، کاتێکیش کەسێکی دڵگەرم بێ زانیاری وەڵام دەداتەوە دەکەوێتە هەڵەوە، بۆیە با کارەکانمان تەنها کاردانەوە نەبێت، بەڵکو لەسەر ئەساسێکی عیلمی بێت.

پاشان لادانە ئەخلاقییەکان چەندین ڕەهەندی هەیە، کاتێک دەمانەوێت بیناسێنین و کاری لەسەر بکەین، لەوانە: ڕەهەندی کۆمەڵایەتی، ڕەهەندی سیاسی، ڕەهەندی پزیشکی، دەروونی و ئابووریشی هەیە. لەبارەی چۆنیەتی بەرەنگاربوونەوەی لادانەکانیش، با تەرکیز بکەینە سەر واقیعی هەرێمی کوردستان، ئەوەش بەهەند وەربگرین، کە ئیسلام کاریگەریی تەواوی بە سەر کۆمەڵگەی کوردییەوە بەجێهێشتووە، تەنانەت ئەو کەسانەی، کە نوێژ ناکەن بەم بابەتە بۆیاخکراوانە ڕازیی نین. لەوچوارچێوەیەشدا دەبێت خاڵی هاوبەش لەگەڵ ڕەوت و کەسانی جیاواز بۆ ڕووبەڕووبەڕووی ئەم پرسانە بدۆزینەوە.

تێبینی: نووسینەوە و داڕشتنەوەی بابەتەکە و ڕیزکردنی ناوەکان پەیوەندیی بەو ڕیزبەندییەوە هەیە، کە لە دیدارەکەدا داوای کردووە کاتی پێ بدەن و قسەی خۆی کردووە.

## • د. فاروق عەبدوڵڵا:

– دەبێ دەردەکە دەست نیشان بکەین، تاکو بتوانین دەرمانیشی بۆ دابنێین. جاران پێمانوابوو «شەیتان» تەنها وەسوەسە دروست دەکات، تەنانەت هەندێک باوەڕیشیان پێی نەبوو، بەڵام ئێستا مەعبەدی هەیە و بەناوی «ئازادیی تاک»ەوە دەپەرسترێت. فەلسەفەی لیبراڵی، کە لە ڕۆژئاوا هەیە و بۆتە پارێزەری ئەو بۆچوون و ڕایانە، پێیوایە مرۆڤ ئازادە چی دەکات، چ هەڵدەبژێرێت، بۆیە ژن ئازادە، پیاو ئازادە، کەس مافی نییە بڕیارتان بۆ بدات، تەنانەت لەباربردنی منالیش پێیانوایە هی کۆمەڵگە نییە، بەڵکو هی تاک خۆیەتی، هەرئەوەشە کە خوا لە قورئاندا دەفەرموویێت: «مَنِ ٱتَّخَذَ إِلَٰهَهُۥ هَوَىٰهُ"٠ بۆیە بەڕاستی خەتەری هاوڕەگەزبازیی لەوەدایە، کە مرۆڤ دەبێتە عەبدی حەز و ئارەزووەکانی.

دەبێت لە هاوڕەگەزبازیی تێبگەین، کە بەڕاستی بۆ لەناوبردنی مناڵە، دواجاریش بۆ لەناوبردنی مرۆڤە. جاران لە سلێمانی شتێک نەبوو بەناوی کێشەی ژن و پیاو بەو ڕێژەی، کە ئێستا بوونی هەیە، وایلێهاتووە کێشە لە هەموو شوێن و ماڵێکدا هەبێت، لە نێوان باوک و کچ، گەنج و پیر، لە دائیرەکان لە نێوان بەرپرس و کارمەندانی خوارەوە.

- جێندەر و هاوڕەگەزبازیی جیاوازن و دەبێت هەریەکەیان لە شوێنی خۆیدا دابنێین.
- لە ڕووسیا و چین و یابان و چەندین وڵاتی تر بابەتی جێندەر و هاوڕەگەزبازیی فەشەلی هێنا، چونکە پێیانوابوو کۆمەڵگە هەڵدەوەشێنێت.

## • د. هەتاو حەمەساڵح:

- نەتەوەیەکگرتووەکان بەبێ پرسکردن هەندێک چەمک زاڵ دەکات، بۆیە ئەم سەردەمە سەردەمی یاریکردنە بە چەمکەکان، جێندەر یەکێکە لەوان.
- پێشتر وترا با سوود لەلایەنە باشەکانی (جێندەر) وەربگرین، من لەگەڵ ئەمەدا نیم، چونکە بەڕاستی ئێمە لە زانکۆکان پێشتر وامانکرد، بەڵام هەستمان کرد باشییەکانی دەقۆزرێتەوە بۆ شتی تر. جێندەر خۆی (٣) بەشە، یان ئاستە، دەتوانین بڵێین لە (١٥٪)ی هاتووە و (٨٥٪) ماوە.
- سەنتەرەکانی جێندەر، کە لە زانکۆکانی کوردستاندا بوونیان هەیە، وەک دابینکردنی هەلی یەکسان بۆ هەر دوو ڕەگەز دەستمان بەکار کرد، نەک هاوڕەگەزبازیی، هەربۆیە دواتر ڕایانگەیاند: ئەگەر بابەتی جێندەر بەرەو هاوڕەگەزبازیی بڕوات، ئەوا وازدەهێنین.
- هەروەها بە شێوازێکی زانستییانە تاوتوێ و موناقەشەی ئەم بابەتانە بکەین. بۆنموونە ئەو (١٥٠) کەسەی، کە ئیمزایان کردبوو و دەڵێن: جێندەر هاوڕەگەزبازیی نییە و سوودیان لە تیۆری (جۆن مۆن)ی وەرگرتووە، کە لە ساڵی ١٩٥٢دا داینا، ئەو تیۆرە دەیان ڕەخنەی لێگیراوە و چاو لەو ئاست ڕەخنانە دەنووقێنن، تیۆرییەکە دەڵێت: هەر ڕەگەزێک (کوڕ یان کچ) بە هەرشێوازێک گەورەی بکەی، ئەوا سروشت و هەڵسوکەوتی ئەو ڕەگەزە وەردەگرێت، کە لەسەری گەورە بووە، یان پەروەردە کراوە. واتا کوڕێک وەک کچێک و کچێکیش وەک کوڕێک هەڵسوکەوت دەکات، بەڵام ئەم تیۆرییەکە سەرلەبەری هەڵەبوو، چونکە دەیان ڕەخنەی ئەکادیمی لێگیرا و (دیڤید رایمەر)، کە وەک حەقلی تەجریبی دەستنیشانی کردبوو، هاواری لێهەستا و وتی: من چەندین ساڵە کەپتکراوم، بۆیە ساڵی ٢٠٠٢ خۆی کوشت و پاشان براکەشی خۆی کوشت و هەموو ئەو گریمانانەی کە دایناڕبوو، هەڵە دەرچوو.
- لە ڕێگەی جێندەرەوە دەیانەوێت سروشتی دوانەیی تێک بدەن، دەڵێن بۆچی تەنها ژن منداڵی ببێت.
- سەنتەرەکانی جێندەر لە کوردستاندا بەمەبەست گەورە کراون، دەنا ئەوەندە چالاک نین، ساڵانە تەنها (٣) چالاکییان هەیە، بەڵام هەندێ پەیجی سۆشیال میدیا تەرویج و بانگەشەیان بۆ دەکەن.
- دەبێت ئیسلامییەکان گوتار (خطاب)یان بەرامبەر بە ژن بگۆڕن، هەندێک فەرموودە هەیە، هەرچەندە دەوترێت زەعیفە، کەچی بەداخەوە لەلایەن هەندێک بانگخوازەوە دژ بە ئافرەت بەکاری دەهێنن.

## • د. دانا فازیل:

قسەکردن لاوازترین چەک و پێشنیازە لەم بابەتەدا، بەڵکو دەبێت ئێمە بە شێوازی تر بچینە مەیدانی وەڵام دانەوەوە. بلوم، کە پسپۆڕێکە لە بواری بەها و سلوکدا، سێ ئاستی بۆ گۆڕانکاریی لە کۆمەڵگەدا دەستنیشان دەکات:

١- قسە: لەگەڵ ئەوەی قسە سەرەتای هەموو گۆڕانکارییەکانە، بەڵام لاوازترینیشە، بۆچی؟ چونکە قسە کاتی کەم دەوێت و لایەنی کرداریشی لەگەڵدا نییە.

٢- سلوکی کرداریی: بۆ نموونە گەر کەسێک بمانەوێت فێری شۆفێری بکەین، تاکو خۆی نەچێتە سەر جادە و سووکان نەگرێت، دەستی ڕانایەت، کاتێکیش کە چووە شەقام، دەیەوێت سەرکێشیی بکات و بۆئەوەی ببێتە شۆفێرێکی سەرکێش. واتا سلوکەکە نەبووەتە بەها.

٣- بەها (قیەم): کێشەی ئەم قۆناغە لەوەدایە، کە پێویستی بە کاتە، تاکو شتەکانی لا دەبێت بە بەها، ناوبەناویش بیری بخرێتەوە، چونکە زۆربەی کات ئەوەی بە دەورەیەک فێری کەسێک دەکرێت، دوای ماوەیەک بیری دەچێتەوە. هەربۆیە لای من باشترین میکانیزمێک، کە بۆ ڕووبەڕووبوونەوە دەیخەمەڕوو، ئەوەیە کە ژمارەیەک باخچەی ساوایان و خوێندنگا و زانکۆ دابمەزرێنین، کە گرنگی بە بواری پەروەردە بدات.

## • م. شێخ محسین حسێن:

- قسەکانی بە ڕەخنە لە ڕابوونی ئیسلامی دەستپێکرد و وتی: دەبێ دان بەو ڕاستەیەدا بنێین، کە ئیسلامییەکان شتی نوێیان بۆ کۆمەڵگە پێی نییە، شتەکانی دەوروبەریان دووبارە دەکەنەوە، کەمتر کار لەسەر کولتووری باو کراوە، بەڵکو کار لە سەر کولتووری زاڵ دەکرێت.

- لە ئێستادا کۆمەڵگەی کوردیی پێویستی بە مەناعە هەیە. جاران ئیسلامییەکان لە ململانێیەکی ئایدۆلۆژیدا بوون، بەڵام هەنووکە لە ململانێیەکی ئەخلاقیدان.

- پێشنیاز دەکەم ئێمە وەک ئیسلامییەکان خۆمان ببینە خاوەنی ئەم چەمکانە.

- لایەنی کرداریی زۆر گرنگە و دەبێت وەڵامدانەوەکانمان خاڵیی نەبێت لەو ڕووەوە. بۆ نموونە ئامادەکردنی ژمارەیەک کتێب و نامیلکە و چاپکردنیان.

## •د. جەعفەر عومەر:

- ڕێژەی هاوڕەگەزبازیی لە جیهاندا ناگاتە (٢٪)یش، نەک وەک هەندێک دەڵێن ڕێژەکە (٥٪)ە، چونکە پرسێکی نامۆیە بە سروشتی مرۆڤ.

شوناسی جێندەری: لێرەدا دەبێت قسە لە سەر دوو گروپ بکەین و لێکیان جیابکەینەوە، یەکەمیان هاندەرن لەگەڵ ئەوانەی، کە هاندراون، ئەوەی دووەم قوربانییە و دەبێت دژایەتی نەکرێت.

- هاوڕەگەزباز سێ ئاستی هەیە، ئاستی یەکەم ئەنجامدەرە و کارەکە دەکات، دوو ئاستەکەی تر هەر نایکات.

– یەکێ لە چارەسەرەکان ئەوەیە، کە گرنگی بدەین بە پەروەردەی سێکسیی.
– لەم کارانەدا دوو گرووپ ئاراستە دەکرێن ئەوانیش دایباب و مناڵ دەگرێتەوە، هەر منالیشە کە سبەینێ دەبێتە هەرزەکار، بۆیە دەبێت کاریان لە سەر بکرێت، بەتایبەت دایباب ئیتر بە خول بێ، یان دانانی ڤیدیۆی کورت، یاخود هەر ڕێگایەکی تر.
– جێندەر و سێکس لێکجودان، جێندەر بریتییە پاڵنەری کەسیی و کۆمەڵایەتی و دەروونیی تاکێک ئایا ژنە یان پیاو، بەڵام سێکس مەیلێکی بایلۆلۆجییە.

## •م. حەکیم ئەبوبەکر:

– ئێستا لە ڕۆژئاوا کەسانێکی زۆر دژایەتی بابەتی هاوڕەگەزبازیی دەکەن، ئێمە دەکرێ سوود لەو چارەسەرانە وەربرگرین، کە ئەوان دایانناوە، چونکە ئەزمونیان کردووە، هەروەها سوود لەو ڕاپۆرت و ڤیدیۆییانە وەربگرین، کە وەک چارەسەری کرداریی لەلایەن ڕاهێنەران و شارەزایانی خۆیانەوە ئامادەکراوە.

## •د. محەمەد پێنجوێنی:

– بەشێک لە پیاو و ژن هەن، کە هەستیان بۆ ڕەگەزی بەرامبەر نییە، بەڵکو هەستیان بۆ ڕەگەزی خۆیان هەیە، من بەشێکیان دەناسم، هاتوون و باسیان حاڵی خۆیان کردووە، تەنانەت تیایاندایە پەنای بۆ خۆکوشتن بردووە، بۆیە دەبێت لە شوێنێکدا کۆبکرێنەوە و چارەسەریان بۆ بدۆزینەوە، ناشبێت چاوەڕوانی حکومەت بین، چونکە من وەک خۆم زیاتر (٢٠) پرۆژەم تەسلیم بە حکومەت و لایەنی پەیوەندیدار کردووە، بەڵام هیچیان وەڵام نەدراونەتەوە.

## •م. ئامینە سدیق:

– ئافرەت زۆربەی کات لە ئەنجامی دەستدرێژییەکەوە، کە لە سەر منالی لێکراوە، بۆیە ڕقی لە پیاو دەبێت، هەروەها ژنیش هەیە لە ژینگەی ماڵەوەیان لەگەڵ کوڕدا بەخێوکراوە، بۆیە سلوکی دەگۆڕێت، واتا ئەمەیان جیاوازە لەگەڵ ئەوەی هەندێک بانگەوازی بۆ دەکەن.
– جێندەر لە ڕێگەی وەرگرتنی فەندەوە ئێستا دەستیان خستۆتە ناو خوێندنگاکانەوە و بەشێکیان هەڵخەتاندووە.
– دەبێت مەترسییەکانی هەڵوەشانەوەی خێزان بخەینەڕوو.

## •د. فاتیح شوانی:

– لە سەرەتادا دەبێت ڕێبکەوین لە سەر چەمەکەکان.
– شوناسی جێندەری بەشێکی هۆمۆسێکسوالی نییە.
– هاوڕەگەزبازیی لە دەروازەی جێندەرەوە جێبەجێ دەکرێت.

**•د. دنا عەلی بەرزنجی:**

– ئەم لادانە ئەخلاقییانە لەمێژە هەیە و تازە نییە، لە سەردەمی پێغەمبەر (لوط)یشدا سەلامی خوای لێ بێ هەبووە.

هەروەک چۆن پەراوێزخستنی ئەم بابەتە هەڵەیە، بەهەمان شێوە گەورەکردنیشی هەر ڕاست نییە، چونکە لای نەتەوەیەکگرتووەکان لە ڕێگەی ژمارەیەک ڕێککەوتننامە و چەمکی وەک عەولەمەوە دەیانەوێت هەندێک بابەت، کە زادەی وڵاتانی ڕۆژئاوایە بە یاسایی بکەن و بیانخانە نێو کۆمەڵگاکانی تریشەوە.

– گەر حزبێک لە ئەوروپا بانگەشەی پاراستنی هاوڕەگەزبازیی بکات، بێگومان سەرکەوتن بەدەستدێنێ، ئەی ئەگەر لێرە بانگەشەیەکی وابکات، خەڵک گاڵتەی پێدەکات، کەلتووری خۆمان جیاوازە، عەشیرەت و خێزانی پاراستووە بەپێچەوانەوەی ڕۆژئاواوە.

– ئەم هەوڵانەی کە دەدرێت بۆ بە لاڕێدابردنی کۆمەڵگە، بیرێکی نەزۆکە، لە سەدەی ڕابردووشدا چەندین هەوڵی لەم شێوانە هەبوون، بەڵام سەرکەوتوو نەبوون.

**• بەکر حەمەسدیق:**

– فۆڕمی خێزان و بنەماڵە لەم کۆمەڵگایانەی لای خۆمان فۆڕمێکی ئەساسییە، لای ئیسلام و مەسیحی و تەنانەت ئێزدییەکانیش لایان گرنگە.

– جێندەر بەشێکی واتای یەکسانی نێوان ژن و پیاوە، ئەمەیان جیاوازە لەوەی، کە دەیەوێت ڕەگەزی خۆی بگۆڕێت. بەشێکی ئەم کێشانە پەیوەستە بە فشاری نێودەوڵەتییەوە بۆ چەسپاندنی چەند چەمکێکی دیاریکراو.

– بەداخەوە حکومەتی هەرێمی کوردستان لە ڕۆژنامەی (وەقائیع)دا بەڕەسمی ڕەزامەندیی خۆی نیشانداوە لەسەر بابەتی جێندەر و پشتیوانی دەکات.

– نەتەوەیەکگرتووەکان لە ڕێگەی ڕێککەوتننامەی (سیداو)ەوە دەیەوێت فۆڕمی خێزان لە هەموو وڵاتاندا لەسەر ئەساسی ئەو ڕێککەوتننامەی خۆیانەوە بگۆڕن، کە ئەویش دوو خاڵ دەگەیەنێت، یەکەمیان یەکسانی نێوان ژن و پیاو لە هەموو بوارەکاندا، خاڵی دووەم ترسناکترە و دەبێت خوێنەوارەکان زیاتر کاری لە سەر بکەن، گۆڕینی جۆری کۆمەڵایەتییە، کە پشت بە بنەماڵە و خێزان دەبەستێت، کە ئایین و دابونەریت ڕۆڵی سەرەکی هەبووە لە دروستبوونیدا.

–داوا دەکەم حیزبە ئیسلامییەکان زیاتر لێک نزیک ببنەوە و کار لەسەر بەهێزکردنی لایەنی پەروەردەیی تاکی کورد بکەن.

–من خەڵکانێکی زۆر دەناسم نوێژ ناکەن و تەنانەت خۆیان دەڵێن مولحیدین، بەڵام کاتێک کە ژن و ژنخوازیی دەکەن، دەڵێن با مەلا بێت و ئەو چەند تقوسە بخوێنێت، کەواتە ئەوە خۆی مەفهومی پاراستنی خێزانە.

**• حاکم شێخ لەتیف:**

– ئەم بابەتانە زۆر گرنگە کە ئێستا باس بکرێت، چونکە لەلایەن ئیسلامیی و عەلمانییەکانەوە وروژێنراوە، بەداخەوە بە بێلایەنیش مامەڵەی لەگەڵدا ناکرێت.

– ئەم پرسانە زۆر گەورە نەکرێت، لەبەر دوو هۆکار، یەکەمیان لەبەرئەوەی بابەتەکە تازەیە، دووەمیان ئەوە بخرێتەڕوو، کە پێچەوانەی دابونەیت و ئایینە، کە سەدان ساڵە لەسەری پەروەردە بووین. لە ئەورووپاش مەسەلەی هاوڕەگەزبازیی نەبووەتە شتێکی ئاسایی.

– من ئەو چەند ساڵەی لە مەحکەمەی ئەحداس بووم هیچ کەسێکی وام نەهاتووەتە بەردەست، کە ئاماژە بێت بۆ جێندەر و هاوڕەگەزبازیی.

**• م. نازم عەبدوڵڵا:**

– ئەم پرسە ئێستا بووەتە کێشەیەک و لەلایەن بەشێک لە وڵاتانی ڕۆژئاواوە ئاڕاستەی وڵاتانێکی موحافیزکار دەکرێت، ئەم لادانانە نوێ نین، بەڵکو نووسەرێکی وەک (عەلی وەردی) لە کتێبەکانیدا ئاماژەی بۆ کردووە، بەڵام ئەوەی ئێستا هەیە، کە ئاڕاستە دەکرێت، هەروەکو لە سەرەوە ئاماژمان پێدا، تەنانەت ڕووسیا هاواری لێهەستا و دژایەتی دەکات، زۆر جیاوازە لەو چەند نموونە شازانەی، کە هەبوون، بۆیە بەڕاستی دەبێت بزانین چۆن چارەسەری بکەین؟ کە ئەمە بەلای منەوە زۆر گرنگە، بەڕای من با سەرۆکی هەرێم و پەرمان و حکومەت لەم بابەتە ترسناکە ئاگادار بکرێتەوە. داوا دەکەم ئەم جۆرە کار و چالاکییانە فراوانتر بکرێن، حیزبە ئیسلامیی و عەلمانییەکان بەیەکەوە ڕووبەڕووی ببینەوە، ڕایەکی گشتی دروست بکەین، تەنانەت کۆنگرەیەک ببەستین.

**• د.محەمەد سینەمۆکی:**

– دوو جۆر پلان بۆ بەرەنگاربوونەوەی ئەم بابەتانە پێویستە، خەڵکی ئاسایی لێی ئاگادار بکرێتەوە وەک (تاکتیک) و ژمارەیەک هەنگاوی تر بنێین لەوانە هۆشیارکردنەوە و هاندانی جەماوەر بۆ نارەزایی دەبڕین. هەروەها پلانێکی درێژخایەن (ستراتیژیی) مان هەبێت، کە دەچێتە بوارە پەروەردەییەکەوە، واتە دیراسەی قووڵمان هەبێت، کە لە پرۆسەی پەروەردەدا وەڵامی گەنجان بداتەوە.

– ئێمە لە پەروەردەی سێکسیدا لاوازین.

**•د. ئیسماعیل بەرزنجی:**

– من دەڵێم با ئەم جۆرە بابەتانە بچووک بکرێتەوە بۆ خەڵکی عەوام، کە هەر لێشی تێ ناگات، چونکە ڕێژەکە ئەوەندە جێگەی مەترسی نییە، هەروەها لەگەڵ گەورەکردنیدام بۆ نوخبە، با گرنگی زیاتری پێ بدرێت.

- بۆ ڕووبەڕووبوونەوەشی با لەسەر دوو ئاست بێت: ئاستە عامەکە، کە پەیوەستە بە هەرچی زیاتری مانەوەی هەژموونی ڕۆژئاوا، نەک یارمەتی کۆمەڵێک خەڵک بدەن کە تووشبوون. چەند چەمکێک وەک مافی مرۆڤ و دیموکراسی و ئازادیی کاڵبوونەتەوە، دەیانەوێت لەم ڕێگایانەوە بیری خەڵکی بهێننەوە.. شێوازە شەعبییەکە، کە پێویستی بەوە نییە بۆی ڕوون بکەیتەوە کە فلان چیە، بەڵکو بە شەیتانی بکرێت.. هەروەها لەسەر ئاستی دووەمیش، کە ئاستی نوخبەیە، ئەمەیان پێویستە و دەبێت کاری جددی بکرێت.

## • م. هاوژین عومەر:

- گەر هەندێک لایەن بیانەوێت ئیستفزازی هەستی مسوڵمانان بکەن، ئیسلامییەکانیش دەتوانن ئەو کارە بکەن...

- شەڕی میدیا و سۆشیال میدیامان هەڵەیە، زۆر کەیس هەیە لەوانە: بابەتی فرەژنی، پرسی تەبشیر، پڕۆژەی یاسای دەستوور، گۆڕینی یاسای ئەحوالی شەخسی، هەمواری یاسای پەروەردەی ئیسلامی.

- من لەگەڵ بەرەنگاربوونەوەم، بەڵام بە نەرمیی و بە عاقڵانە، زۆر چارەسەر هەبووە هەڵەی لێی کەوتووەتەوە.

## • د. محەمەد تاهیر بەرزنجی:

- کاتێک دەوترێت با بە زانستییانە ڕووبەڕووی ئەم بابەتانە ببینەوە، بەڕاستی ئەوەش ئاسان نییە و خۆی لە خۆیدا کێشەیەکی ترە، گەر نەزانین چۆن ڕووبەڕوو دەبینەوە؟ بە دیدارێک ڕەنگە کافی نەبێت.

- با کارەکانمان کاردانەوە نەبێت، زانستی پێویستمان بە شتەکان هەبێت.

- مەناعەیەکی فیکریمان هەبێت و بایەخی زیاتر بە خێزان بدەین.

- لە نێوان مرۆڤەکاندا هەندێک شت هەیە هاوبەشە، یەکێک لەوانە بەهای عەدلە، ئەوەش کە وترا کابرا نوێژ ناکات، بەڵام پەیوەستە بە زۆر شتی ئایینەوە، ئەمانە دەبێت بقۆزرێنەوە و زەق بکرێنەوە.

لە کۆتایدا د. سەباح بەرزنجی سەرۆکی سەنتەری زەهاوی ئاماژەی بە گرنگی و پێویستی ئەم جۆرە دیدارانە داو، گووتی: دیبەتێکی زۆر گرنگە و لە جێگەی خۆیدابوو، بەتایبەت کە ئێستا زیهنی گەنجانیان بەچەند بابەتێکی تێکداوە، وەک (جێندەر، یەکسانی نێوان هەر دوو ڕەگەز، بێ بەهاکردنی خێزان لە کۆمەڵگەدا...هتد)، وتیشی ئێمە وەک (زەهاوی) ئامادەین بۆ هەر کارێک، وەکو پێشتریش کردوومانە، جا چاپکردنی کتێب و بڵاوکردنەوەی بێ، یان گرێدانی کۆنگرە و کۆنفرانس بێ لەگەڵ زانکۆکانی کوردستاندا.

دواخاڵ

پاریس: ئەنیسە مخالدی
وەرگێڕانی: خاڵ

# بۆچی توانای خوێندنەوەی قووڵمان لەدەستداوە؟

## توێژینەوە نوێیەکان هەندێك لە هۆکارەکانی ئاشکرا دەکەن

«خوێندنەوە کلیلی عەقڵ و خۆراکی ڕۆحە»، بەڵام پێدەچێت لەگەڵ تەقینەوەی زانیاریی و ئامرازەکانی پەیوەندی کۆمەڵایەتی، وەک لێکۆڵینەوەکانی ئەم دواییە ئاماژەی پێدەکەن، خوێندنەوە بەشێوەیەکی سەرنجڕاکێش دابەزیبێت، بەتایبەتی خوێندنەوەی قووڵ.

دوایین توێژینەوەی پەیمانگای نیشتمانیی کتێبی فەڕەنسی (CNL) کەمبوونەوەی ئەو کاتەی بۆ خوێندنەوە تەرخانکراوە ئاشکرا کردووە؛ بەجۆرێک بووەتە زیاتر لە سێ کاتژمێر لە هەفتەیەکدا، بە بەراورد بە فراوانکردنی ئەو کاتانەی کە بۆ سۆشیال میدیا و بڵاوکراوە ئەلیکترۆنییەکان تەرخانکراون، کە بوونەتە زیاتر لە سێ کاتژمێر و نیو لە ڕۆژێکدا.

هەرچەندە لەو کاتەوەی کە چووینەتە ناو سەردەمی تەکنەلۆژیای دیجیتاڵییەوە چاوەڕوانی ئەم جۆرە ئەنجامانە کراوە، بەڵام ئەوەی لە توێژینەوە نوێیەکاندا نوێیە، دۆزینەوەی دیاردەی دابەزینی «خوێندنەوەی قووڵ»ە، کە بریتییە لە لەدەستدان یان سستکردنی خوێندنەوەی بەردەوام کە بە پلەی یەکەم پەیوەستە بە تێڕامانەوە مانا و وشە نووسراوەکان. بەگوێرەی هەمان لێکۆڵینەوە لەسەدا ٤٧ی فەڕەنسییەکان وەڵامیان داوەتەوە بۆ ماوەی زیاتر لە دە خولەک زیاتر توانای خوێندنەوەیان نییە و زۆرجاریش لەکاتی گۆڕینی کەناڵە تەلەفزیۆنییەکان یان لە نێوان لاپەڕەکانی تۆڕە کۆمەڵایەتییەکاندا بەسەر دەبەن و هەندێکیان لەکاتی وەڵامدانەوەی کورتە نامەدا دەخوێننەوە یان لەکاتی گوێگرتن لە مۆسیقا.

ئەم دیاردەیە ڕۆژنامەی "سلات" لە چاپی فەڕەنسی خۆیدا لە وتارێکدا بە ناونیشانی: "هەست دەکەیت لە خوێندنەوەی کتێب بێ توانا بوویت؟ گوزارشتی لێ کردووە، کە پێی وایە نەخۆشییەکی باو و ئاساییە. بابەتەکە ڕوونی دەکاتەوە: "ئەستەمە سەرنجت لەسەر خوێندنەوە بێت لەکاتێکدا کە ڕژانێکی بەردەوامی نامەی ئەلیکترۆنی و خێرا و تۆڕە کۆمەڵایەتییە جۆراوجۆرەکان ڕووت لێ بنێن... هەر کە لاپەڕەیەک دەکەیتەوە ڕیکلام و بەستەرەکان دەبینیت وەک ئەوەی باز بە دەموچاوتدا بدەن، بوونی بەردەوامی ئەم هاندەرانە گواستنەوەی زانیاری لە نێوان یادەوەری هەستیاریی و بیرەوەریدا دەوەستێنێت». ئەمەش لەلایەن شارەزایانەوە پشتڕاستکراوەتەوە کە هۆشدارییان دا لە لەناوچوونی ئەو شتەی کە پێی دەڵێن «مێشکی خوێندنەوەی قووڵ» ئەگەر فێر نەبین لە سەرقاڵکردنەکانی تۆڕی جیهانی دوور بکەوینەوە.

نووسەری ئەمریکی نیکۆلاس کار، یەکەم کەس بوو لە ڕۆشنبیران کە زەنگی ئاگادارکردنەوەی لێ دا لە کتێبەکەیدا کە «ئینتەرنێت چی لە مێشکمان کردووە؟» (کە پاڵێوراوبوو بۆ خەڵاتی پولیتزەر) کاتێک کتێبەکەی بەم دەستەواژانە دەستپێکرد:»هەستێکی نائارامکەرم لەم دواییانەدا هەبووە کە کەسێک تێکەڵ بە مێشکم دەبێت، من بەزەحمەت دەزانم کتێب بخوێنمەوە، فۆکەسەکەم ئەوەیە پەرش و بڵاو بوومەوە دوای یەک دوو لاپەڕە... دڵەڕاوکێم هەیە و بەدوای شتێکی تردا دەگەڕێم بۆ ئەوەی بیکەم». هەست دەکەم کاتم بۆ تەرخان دەکەم بۆئەوەی مێشکی دواکەوتووم بگەڕێنمەوە بۆ دەقەکە... ئەو خوێندنەوە قووڵەی کە جاران هاتنی ئەوەندە سرووشتی بووەتە ململانێی ڕۆژانە".

هەمان تێبینی لەلایەن کاترین هایلز، مامۆستای ئەدەبی زانکۆی دوک تۆمارکراوە، کە لە کتێبی «خوێندنەوە و بیرکردنەوە لە دیجیتاڵ میدیادا» نیگەرانی خۆی لە بڵاوبوونەوەی ئەم دیاردەیە دەربڕیوە، کە مەترسی لەسەر پەرەپێدانی توێژینەوە و مەعریفە دروست دەکات سەبارەت بە ئەزموونەکەی وەک پرۆفیسۆر:»سەرەڕای هەموو هەوڵەکانم، سەرکەوتوو نەبووم لە هاندانی خوێندکارەکانم بۆ خوێندنەوە»، تەنانەت ئەگەر کورتە ڕۆمانێکی فۆلکنەریش بێت... کاتێک داوایان لێدەکەم لێکۆڵینەوە لەسەر نووسەرێک پێشکەش بکەن، بۆم دەردەکەوێت ئەوان بە بەکارهێنانی گووگڵ بۆ بینینی بەشێک لە نووسینەکانی. چونکە بە سادەیی ناتوانن کتێبێک بخوێننەوە لە سەرەتاوە تا کۆتایی...».

هەروەها سەندیکای نیشتمانیی چاپ و بڵاوکردنەوەی فەڕەنسا هۆشداری دا لە دۆخی خوێندنەوەی قووڵ، لە نوێترین ڕاپۆرتدا کە لە ماڵپەڕەکەیدا بڵاویکردووەتەوە، ئاماژەی بە سوودەکانی کردووە و دەڵێت: «خوێندنەوەی قووڵ فەزیلەتێکی زۆری هەیە: وەک

پەرەپێدانی بیرکردنەوە، گێڕانەوە لەسەر بنەمای لۆژیکی یەک لە دوای یەک و گەشەکردن یادەوەری ڕووداوەکە، چونکە سەرنج و تەرکیز بەرز دەکاتەوە، پەرەپێدانی یادگە و دروستکردنی هەستی ڕەخنەیی تاک.

هەموو ئەم شایەتحاڵانە پەنجە دەخەنە سەر ئینتەرنێت کە بەرپرسیارە لە دابەزینی وشەی نووسراو لەبەردەم ئامرازە بینراو و بیستراوەکاندا. تەکنەلۆژیا شێوازی وەرگرتنمانی گۆڕیوە، چونکە لافاوێکی ناوەڕۆکمان پێشکەش دەکرێت کە پێویستی بە خوێندنەوەی خێرا و ڕووکەش و پارچەپارچە هەیە و لەکاتێکدا بڕی ئەم ناوەڕۆکە کە وەریدەگرین زیادی کردووە، کوالێتییەکەی کەمیکردووە، و زیاتر مەیلمان بۆ زانیاری خێرا هەیە، بەڵام قووڵییەکەی بووە ڕووکەش.

توێژینەوەیەکی زانستی ئان مەنگەن توێژەری نەرویجی هەمان شت پشڕاست دەکاتەوە، کە داوای لە دوو تیمی خوێنەر کرد کورتە چیرۆکێک بخەنەڕوو، تیمی یەکەم لە ڕێگەی کتێبێکی کاغەزی و دووەمیش لە ڕێگەی کتێبێکی ئەلیکترۆنییەوە کە ڕێگە بە گەڕان دەدات لە ئینتەرنێت، و... ئەنجامەکەی ئەوەیە کە ئەو کەسانەی دەقەکەیان لەسەر کاغەز خوێندووەتەوە سەرکەوتووتر بوون لە کورتکردنەوەی چیرۆکەکە.

بەهەمان ئەنجام توێژینەوەیەکی تری ئەمریکی کە لەسەر ١٧٠ هەزار خوێنەر ئەنجامدراوە، دەرکەوتووە خوێندنەوەی کتێبێکی کاغەزی ناوچەکانی بیرەوەری مێشک و قسەکردن و پرۆسێسی بینین چالاک دەکات، وەک شێوە و بەرگی کتێبەکە و بۆنکردن و ژمارە و ئەستووری... لاپەڕەکان هەموویان یارمەتی مێشکمان دەدەن بۆ باشتر تێکەڵکردن و پاراستنی ئەو زانیارییانەی کە دەگەنە دەستی، بە تێپەڕبوونی کات، لە کاتێکدا چیرۆک و ڕۆمانەکانی خوێندنەوە لەسەر شاشەکان پەیوەستن بە ئەزموونێکی هەستیاری کەمتر تایبەتەوە، کەمتر پرۆسێس دەکرێن و زوو لەبیر دەکرێن.

توێژەری فەڕەنسی ئیڤ سیتۆن، مامۆستای ئەدەبیات، پێی وایە کێشەکە گەورەترە لە ئامرازەکانی تەکنەلۆجیای مۆدێرن، وەک لە کتێبی "ئیکۆلۆژیای سەرنج"دا ئەمانەی خوارەوە دەنووسێت: "ڕاستە کە تەکنەلۆژیا بەشێکی بەرپرسە لە دابەزینەکە لە ڕێژەی خوێندنەوەدا، وەک چۆن سەرخۆشی سەرنجمان ڕادەکێشێت، بەڵام ئەمە بەو مانایە نییە کە دەبێت مۆبایلەکان بوەستێنین» وە تابلێتی ئەلیکترۆنی، چونکە ئەوەی ڕێگریمان لێدەکات لە قووڵایی کتێب خوێندنەوەدا خۆمان سەرقاڵ بکەین، هەوڵەکانە بۆ ڕاکێشانی سەرنج کە بەرکەوتوو دەبین بۆ لە هەموو ساتێکدا... سەرنجمان بووەتە کاڵایەکی دەگمەن کە کۆمپانیاکان لە ڕێگەی ماڵپەڕ و ئەپلیکەیشن و سۆشیال میدیا و ڕیکلامەوە کێبڕکێی

لەسەر دەکەن، ئەمەش ژینگەیەکی سەرقاڵکردنی دیجیتاڵی هەمیشەیی دروست دەکات کە تێیدا تەرکیزکردن قورسە...».

فەیلەسوفی هاوچەرخی ئەڵمانی هێرمۆرت ڕۆزا باسی کردووە، کە پێی وایە مرۆڤی مۆدێرن لە سەردەمێکی بێ هەناسەدان و خێرابوونی دڵەڕاوکێدا دەژی، کە ڕەنگدانەوەکانی لە کولتوور و لە هەموو بوارەکاندا دیارە، وەک ئەوەی ئێمە بە ڕوونی بووین مەیلی خێراتر خواردنمان هەبوو، و پەیوەندی لەگەڵ ئەندامانی خێزانەکەیدا بە خێراییەکی خاوتر لەوەی کە باوباپیرانمان بوو. سەیرکردنی تەلەفزیۆن، پەیوەندی تەلەفۆنی، پەیوەندی کۆمەڵایەتی، گواستنەوە، ئەنجامدانی کاری کارگێڕیی و خوێندنەوە هەموویان بە خێرایی ڕوودەدەن بەهۆی ئەو تەکنەلۆژیایەی کە ئاسانکاری بۆ دەکات.

مۆنا ئازۆف، فەیلەسوف و مێژوونووسی فەرەنسی، پێی وایە ئەوەی بووەتە ڕێگری لە خوێندنەوەمان، سەختی بەدەستهێنانی ئارامی و گۆشەگیریی و تەنانەت بێزاریشە، کە بۆتە شتێکی دەگمەن، مرۆڤی مۆدێرن چیتر حەزی لەم هەستەی دابڕان لە دەوروبەرەکەی نییە».

ساڵانێک دوای بڵاوبوونەوەی کتێبی "ئینتەرنێت چی لە مێشکمان کرد؟" نیکۆلاس کار هێشتا قەناعەتی بەوە هەیە کە ئێمە چەند هەنگاوێک لە سەردەمێکی دوای خوێندنەوە دوورین، بەڵکو پێشبینی دابەزینی خوێندنەوەی قووڵ دەکات، کە لە ماوەی چەند ساڵی داهاتوودا دەبێتە کاری نوخبە بە تەنها. هەر ئەمەشە فەیلەسوف ماتیۆ کراوفۆرد لە کتێبی «بۆچی جیهانمان لەدەستدا و چۆن بیگەڕێنینەوە؟»ی باسی دەکات، لەوێدا باسی لە سیناریۆیەکی کارەساتبار کرد، کە تێیدا خوێندنەوەی قووڵ سنووردار دەبێت بۆ چەند کەسێک، بەڵام بۆ چەند کەسێک. لەنێو ئەو تیۆرییە ڕەشبینانەدا، هێشتا هەندێک لایەن کارێکی زۆر دەکەن بۆ چاندنی خۆشەویستی خوێندنەوە و کتێب، بەهیوای گەڕانەوەی بەهێز. کۆمەڵەی «بێدەنگ بن... دەخوێنینەوە» کە لەلایەن ئۆلیڤێر دۆلایەر و ئەکادیمی دانیال سلیناڤەوە دامەزرێنراوە، زیاتر لە هەزار دامەزراوەی پەروەردەیی فەرەنسی ڕازی کردووە کە فەرمانی جیاواز پەسەند بکەن کە سنووردارە بە وەستاندنی هەموو چالاکیەکی پەروەردەیی ڕۆژانە، و تەرخانکردنی چارەکێک لە... کاتژمێرێک بۆ خوێندنەوە، هەر بارودۆخێک بێت. لەهەمانکاتدا حکومەتی فەرەنسا خوێندنەوەی وەک «پرسێکی نیشتمانی» تۆمارکرد و هەڵمەتێکی هۆشیاری نیشتمانی دەستپێکرد بۆ هاندانی پراکتیزەکردنی، بەتایبەتی لەنێو گەنجان لە قوتابخانەکان و میدیا جۆراوجۆرەکاندا.

**سەرچاوە: «الشرق الأوسط»، ١٧ یەنایەری ٢٠٢٣ ز، ژمارە [ ١٦١٢١].**